# ڕەنگین



ژمارە (٩)ی تەمموزی ١٩٨٨

مامۆستا قەزاز کارەساتی ٦ی ئەیلولمان بۆ ئەگێڕێتەوە.

## وا سەرکەوتین





لەگەڵ مامۆستای مۆسیقاو ناوازی گورەی ئەنوەر قەرەداغیدا!؟

# شۆڕشی تەمموز شۆڕشی نەوەی نوێو مێژوومانە

گومانی نییە.. [illegible]ردەوە مەزنەکان نەمرن.. ئەو نەمرییە کە گەلیکی مەزن وەدیی دینێت کە سەرکردەیەکی مێژوویی‌و خاوەنی تاقیکردنەوە بۆ دەرەخسێنێت، وەك بۆ گەلی عیراق رەخساو بەرپابوونی شۆرشی «١٧ - ٣٠» تەمموزی پیرۆزی سالی «١٩٦٨» کە هەموو گەلی عیراق بە ئافرەت و پیاوەوە کردە هۆیەکی کاریگەری لە دووبارە بنیاتنانی نیشتمان و هاونیشتمان لەسەر خاکی عیراقدا.. ئەم خاکە تەژییە لە کەلەپووری شارستانییەتی‌و پڕ لە خۆشەویستی‌و پاڵ پێوەنەرە بەرەو بەهرەیی نواندن لە گشت بوارو ئاستەکانی هونەری ژیاندا..

بەراستی.. شۆڕش لە دایك بوونێکی ئەرك گران بوو، بەڵام لەوش گرنگ و گرانتر ئەوەیە چۆنیەتی پاراستنی ئەم لە دایك بووەو چاودێری کردنی تەندروستی‌ی‌و جوانی پەروەردە کردنیەتی..

هەرواش گومانی نییە.. نەمری‌و مانەوەی عیراق شان بەشانی نەمری‌و مانەوەی مرۆڤ و بەردەوامی ژیانە.. پرسوودو سوودمەندییە، هەمان شێوەی سوودو سوودمەندی رووبارەکانی‌و [illegible]ی‌و بەرهەمی دەشت و دۆڵ و [illegible] چیا سەربلندکانی‌و رەزو [illegible] و [illegible]ت و هەمە جۆرە [illegible]

● شۆرشی «١٧ - ٣٠» تەمموزی [illegible] عیراقی شۆرش و [illegible] یەکەم سەرەتای ڕۆژانی سەرکەوتنیدا رووی بایەخدانی کردە بەرژەوەندیەکانی گەل و نیشتمان و پەرەپێدانی تواناو وزەکانی مرۆڤی عیراقی لە پێناوی بنیاتنانی عیراقێکی نوێ‌و گەشەسەندوو پاشەرۆژێکی بەختەوەرو کامەرانی شان بەشانی ئەو هەڵوێستە توندو تیژەی لە روو بەروو بوونی بەرهەڵستکاران و پارێزی کردنی خاکی عیراق و سامانە سروشتی‌یەکانی خاکی ئەم نیشتمانە پیرۆزە، کە لەم لاو لەولاوە دەمی بوگەنیوی گورگە هارەکانی بۆ کراوەتەوە، بەتایبەت لە سنووری رۆژهەلاتی خاکی پیرۆزماندا بە دیاردانی دەستدرێژی کردن بۆ سەر عیراق و گەلی عیراق.. بەڵام ئایا چ دەستکەوتێکی وەدەست هانی‌وە!؟ ئەوەش دوژمنان بە خۆیان باشی دەزانن ئەنجامی ئەو دەستدرێژی کارەیان چی بووە هەروەهاش بۆ جیهانیش روون بووەتەوە ئەنجامی ئەو دەستدرێژیانەیان جگە لە رووڕەشی‌و شکستی هێنانیان هیچی دیکەی دەستکەوتیان نەبووە.. لە هەمان کاتیشدا بوویاز[illegible] چ چەشنە دیوارێکی پۆلاینی هەیە لە رۆلەکانی کە لەیەك ریزدان و بەیەك دڵ و یەك دەست لە درێژترین جەنگدان لە جەنگەکانی ئەم سەردەمەی چەرخی بیستەمدا دژی درندەترین دوژمن کە رژێمی ئێرانی تاوانبارو هاوپەیمانەکانیەتی ئەم جەنگە کە بەزۆرەملێ بەسەرماندا سەپێنراوە

شۆرشی «١٧ -٣٠» تەمموزی نەمر نیشانەو نموونەی جوانی ژیانە.. خۆراگرییە.. سەرکەوتنە.. تیمارکردنی برینەکانی رابردووە.. نوێکردنەوەی خوێنە لە لاشەدا.. ناوەڕۆکی هەستی هەموو مرۆڤێکی عیراقی‌ی سەربەستی‌و سەربەخۆیی‌و ئازادیخوازە..

● ئەوا ئێمەی گەلی عیراق لەم رۆژانەدا ئاهەنگی یادی پیرۆزی بیستەمینی تەمەنی سەرکەوتنی شۆرشە پیرۆزەکەمان دەگێرین - شۆرشی «١٧ -٣٠» تەمموزی نەمرو سەرکەوتوو لە مێژووی نوێماندا -

لە ژێر سێبەری سەرکردایەتی‌یە مێژوویەکەیدا بەرابەری‌و فەرماندەیی سەرۆکمان نەبەزمان صدام حسین «خواپیاریزێت» سور بوونمان دوپات دەکەینەوە کە مرۆڤێکی بەخشندە بین لە پێناوی بەرگری کردن لەم نیشتمانی پیرۆزەمان و بەهیچ شێوەیەك سەنگەر چۆل کەر نین ماوە بە دوژمن نادەین کە بستێك لە خاکی بێگەردو گەوهەرمان بن دەست بکرێت مەبەستە چەپەڵەکانی ئێرانی خومەینی‌و داروودەست و هاوپەیمانەکانی پێشێل بکەین و هەموو پلان و پیلان و نەخشە دوژمنکاریەکانیان گۆربکەین

● بەخێر بێیت ئەی مانگی بەخشندە.. ئەی یادی شۆرشی هیواو ئاوات پیرۆزت بێت رۆڵەکانت کە خۆیان بەخت کردوە لەپێناوی دابین کردنی پاشەرۆژێکی بەختەوەرو کامەرانی بۆ نەوەی داهاتووی گەل و نەتەوە.

● پیروز بێت ئەی سەرکردەی دلێرو نەبەزمان یادی نەمری سەرکەوتنی شۆرشە پیرۆزەکەمان.

● پیرۆز بێت ئەی گەلی قارەمانی عیراق یادی شۆڕشە سەرکەوتووەکەت شۆرشی ١٧-٣٠) تەمموز بە سەرکردایەتی رۆڵەو شاسوارو سوارچاکی گەل و نەتەوە سەرۆك فەرماندە صدام حسین.

● جوانترین پیروز بایی بۆ تۆبێت ئەی سەربازە دلێرو نەبەزەکانی دووهەم قادسیەی عیراق - قادسیەی صدام.

● هەزار سەڵاو لە گیانی پاکی شەهیدانی ڕێبازی سەرکەوتنی عیراق.

● هەمیشە شەکاوە بێت ئاڵای سەرکەوتنەکانمان بە سەر دوژمنانماندا

ئیتر بۆ پێشەوە..

● شفیق محمود جاف

رەنگین
مجلة شهرية سياسية عامة
تصدرها
دار الثقافة والنشر الكردية
بغداد

رئيس التحرير :
مصلح الجلالي

# ڕەنگین

کۆڤارێکی مانگانەی سیاسی گشتییە

سەرنووسەر: **مصلح جەلالی**



۲۸

داخازا من ئەوە گەنجێت مە
خو ژتەقلیدێ بدەنە پاش
(عیسی برواری)



۳۷

کەومکەم ببەزێت
وادەزانم کۆستم کەوتوە
(کەوبازێك)



۱۹

ئایالەچی دەزگایەك دا
بەهرەی زانستی
گەش دەبێتەوە؟

**لە لاپەرەی سێیەمەوە**

## لەنێوان ژمارە هەشت ونۆدا

لەنێـوان دەرچـوونی ژمـارە هەشت و نوی ڕەنگینـدا سێ جەژنمـان گێـرا (یەکـەمیـان) بیـرەوەری بیست سالـەی شۆڕشی حەفـدەی تەممـووزی پێشکـەوتخـواز (دووەمیـان) جەژنی قوربـانی پیـرۆز (سێیـەمیـان) جەژنە کانی سەرکەوتن بە سەر دوژمندا وجاردانی ئاگر بەس.

هەرچـەنـدە ئەم سێ جەژنـە بە سـەریـەکەوە چوارده پانـزده ڕۆژ لەمـاوەی پێشکـەش کردنی دوای خستین بەڵام تامی سەرکـەوتن و هیـوای ئاشتی دوارۆژێکی پرشنگداری بۆ دابین کردین تا وەکـو شانـازی بە شوڕشـەکەمان وسەرکردە قارەمانە کەمان کاك صدام حسینەوە بکەین
ڕەنگین

سکرتێری نووسین: **مصطفی نەریمان**

نرخی ٤٠٠ فلس

**ڕەنگین**
**ناونیشان:** بەغداد
دەزگای ڕوشنبیری و بلاوکردنەوەی کوردی
وەزیریە، تەنیشت «المعهد القضائي»
ت ٤٢٥١٨٤٦ پێنج خەتە
سکرتێری نووسین: ٤٢٥٧٠٢٥

دەرهێنانی هونەری: نزار بەزاز

**دار الحرية للطباعة**



# خۆشیو زەماوەندی گەل لە رۆژی سەرکەوتنی مەزن دا

جەژن و خۆشیو زەماوەند، لەم سەر تا ئەوسەری نیشتمانی خۆشەویستمان لەگەڵ تیشکی زێرینی هەتاودا شاباڵی بە ئاسمانی شین و رەنگینی عیراقدا بڵاوکردەوە ،کەوا بەجاری لافاوی عیراقی‌یەکان بە ژن و پیاو و پیرو لاو و کچ و کورەوە ڕژایە ناو شەقام و گۆرەپان و باغەکان بۆنەوەی هەستو سۆزی خۆیان بە بۆنەی سەرکەوتنی مەزنی عیراقەوە دەرببرن. ئەم دەربرینەش نموونەیەکی راستی خۆشەویستی نیشتمان و خۆشەویستیی سەرکردەی ئازیز صدام حسینە. کەوا رابەرو سەرکردەی وڵات بوو لە سەرکەوتنیکەوە بۆ سەرکە وتنێك تا لە دوایی دا قوربانیو قارەمانیی رۆڵەکانی عیراق تاجی سەرکەوتنیان نایە سەر گەل و نیشتمان. دوای جەنگێکی درێژخایەنی هەشت ساڵە، دوای تۆمارکردنی گەشترین لاپەرەی داستانی سوارچاکانەو قارەمانانە لە جەنگێکی بەرگریو وڵات پارێزیدا، ئێران دانی نا بە راستیی و پێشنیاری عیراقی پەسەند کرد بۆ شەڕاگرتن و دەست کردنە وتوویژی دوو قۆلی هەقیانە. رۆڵەکانی عیراق شاییبکەن، زەماوەند بگێرن، خۆشی دەروونی خۆیان پیشان بدەن. چونکە شەڕراگرتن بە مەرجێك سەربەرزانەو سەرکەوتوانەو لە رووی هێزو تواناوە بێت مایەی بەختەو شانازییە. بێگومان ئەم ئاشتی‌یە، تێك شکانی ئاواتی دەستدرێژیو رووخانی هیوای کۆنەپەرستانەی ئێران دەگەیەنێ، کاتێك ئێران دانی بەمە دا نا کە لە هەموو بەرەکانی شەڕدا سوپاکەی وەکو پووش و پەڵاشێك بەدەم رەشەباوە تێکومەکان دراو لەچەند جەنگێکی بنج بردا شکستی خواردو بەجاری بربڕەی پشتی رژێمەکەی کەوتە ترچەقرچی تێك هەڵوەشان.

ئێمە. لە رۆژی یەکەمی شەرەوە هەر داوای ئاشتیمان کردووەو هەر رێزمان لە هەموو کۆششێك گوتووە کە بۆ ئاشتی کرابێت، هەتا ئەم دوایی‌یەش کە لە هەموو بوارەکانی شەڕدا بەسەر ئێران دا زاڵ بووین و گەیشتینە قۆناغی پیشەسازیی سوپایی و دروست کردنی چەکی قورس هەمیسان هەر لەسەر داخوازیی ئاشتی بەردەوام بووین . بۆیە لە لایەن رای گشتی جیهانەوە هەڵوێستی عیراق پەسەندبوو. وە بۆ هەمووانمان ساغ کردەوە کە ئێمە خاوەن هەقین و خاوەن هەڵوێستی بەهێزو جدەوی ئاشتی نەدەست

# تهنئة



بمناسبة أعياد تموز المجيدة، وإنتصارات قواتنا الباسلة في جبهات القتال نتقدم بأسمنا وبأسم كافة مقاتلي فوج/٤٢/ دفاع وطني/ أسمى آيات التهاني والتبريكات لقائد مسيرتنا المناضل صدام حسين (حفظه الله ). داعياً من المولى عزوجل أن يعيده على الشعب العراقي بعربه واكراده بالعز والعمر المديد لقائدنا.

وبهذه المناسبة نجدد العهد لرئيسنا المناضل أن نكون الجنود الأوفياء خلف قيادتهم للذود عن حياض الوطن الغالي والدفاع عن كرامة الشعب العراقي بعربه وأكراده.



**طاهر حسين محمد الجباري**
**ونجله مريوان طاهر الجباري**
**مستشار ف /٤٢/ دفاع وطني**

خومـان دايـه. بەلـێ.. دەستپێشکـەری ئاشتی لەلایـەن عیـراقـەوە بوو، کەوا سەرۆکـی فەرمـانـدە صدام حسین لە ڕۆژی شەشی ئاب دا نامـە مێـژوویی‌یـە پیـرۆزەکـەی بەرەو ڕووی گەلی عیراق کرد.

لەبەرئەوە جێی خۆیەتی سەرکردەی لە شکرو سەرکردەی نیشتمانمان، سەربـاری ئەوە کە مەردی سەرکـەوتـنـە، ببـێ بە مەردی ئاشـتـی. ئیـتـر جێی خۆیـەتی ڕۆڵەکانی عیراق لەسایەی قارەمانی سەرکـەوتن و قارەمـانی ئاشتی دا هەنگاوی تازە هەڵێنن و پڕ بە دڵ پیرۆزبایی ئەم ڕۆژە پیرۆزە بکەن.

بەڵێ لە هەموو گوشـەیەکی بەغدا و شارەکانی عیراقدا زەماوەند و داوەت و شایی دەستی پێکـرد. نوقـڵ و شەربـەت دابـەش کرا، خەنـە گێـرایـەوەو خوانچـەی پڕ لە مۆم و گوڵ ڕازێنرایـەوە. ڕۆڵـەکـانمـان کەوتنە گۆرانی‌و بانگەوازو هات و هاواری شادی.

ئەمـانـە هەمـوو دەگەیەنن کە ئێمە گەلێکین شەرمـان ناوێ و ئاشتی خوازیـن، دەمـانـەوێ بنیـاتـی نیشتمـان تەواو بکـەین، تا عیـراق بکـەینـە مۆڵگـەی تیشکـدانـەوەی شارستـانـەتی. چونکـە هەر ئەم عیـراقـە لانکی شارستانەتی بوو لە بەرەبەیانی مێژووی زۆر کۆن دا و پێـویـسـتـە لە دوارۆژیش دا هەر سەربـە رزو پێـشـکـەوتـوو و لوتکـەنشین بێت. پیـرۆزبێ ئەم جەژنـە لە گەلـی مەزنـمـان بە سەرکـردایـەتی قارەمانی قادسیە.

قارەمـانـی سەرکـەوتـن و ئاشتی سەرۆ کمـان صدام حسـێـن شانـازیی عیراق. سوپاس بۆ خوا بۆ بەخششی و بۆ سەرکەوتنمان.

● ئیلهام ●





# میوانی ئەم جارەمان یەکێکە لە ڕوشنبیری سی یەکانمان



● مصطفی نەریمان ●

« کەسی وا هەیە لەتافی لاوێتیدا بەرامبەر کارەسات ئەتەپی‌و پیاوی وەهاشمان هەیە کارەسات قالی ئەکاتەوەو ورەی پی بەر نادات، میوانی ئەم ژمارەیەمان یەکێکە لەو شورە سوارانەمان»

سی ساڵ و هەنیکە ئاشنایەتیم لەگەڵدا هەیە. پارچەیەکە لە وەفا و ئەدەب. خاوەن خوورەوشتێکی بەرزو باڵایە، تەمەنی خەریکە خۆی‌بدا لە هەشتا ساڵ بەڵام هێشتا کارەساتی زەمانە پشتی نەچەماندوەتەوەو خوێنی لاوێتی لەدەمارەکانیدا دەجوڵێتەوە، ماموستامان مێژوویەکی زیندوە، لەرەنگین رەنگینترەو کە بێتە سەردانی دەزگا میوانی رەنگین ئەبێت. ئێمەش وا رەنگینی پی‌رەنگین دەکەینەوە.

● ماموستا حەزئەکەین خوێنەرانی رەنگین لە نزیکەوە بتناسن.

ـ ساڵی ١٩١٠ لە سلێمانی لەدایك بوم خوێندنی سەرەتایی‌و ناوەندیم تەواوکردوە لە ساڵی ١٩٣٠وە هاتومەتە بەغدادو لە وەزارەتی ناوخو بومەتە (مترجم وەرگێر) لەم وەزیفە بو ئەو وەزیفە نەقل کراون دوا وەزیفەم معاون مدیر عام طیران مدنی بوە ساڵی ١٩٦٨ خانەنشین بوم و ئەمە پەنجا ساڵ پترە لە بەغداد دائەنیشم

● ماموستا لەسی‌یەکاندا بزوتنەوەیەکی رۆشنبیری لە ئارادا هەبوو ئایا دەوری ئێوەی بەرێز چی‌بوو؟

ـ لەسی‌یەکاندا لاوان یەکترمان ئەگرت و پاڵ پشتی بڵاوکردنەوەی دیاری لادانی یادگاری لاوان و یانەی سەرکەوتن و رۆژنامەو گوڤاربووین، بویە لەگەڵ فائق هوشیارو حامد فرج و برایم هەوڵمان دا گوڤاری گەلاوێژمان لە ساڵی ١٩٣٩ دەرکرد، ساڵی ١٩٤٢ داوامان لە خوالی خوشبو (علاءالدین سجادی) کرد بیگرێتە ئەستو، خوا هەقە هەڵبژاردنەکەمان لەجێی خۆیدابوو ئەویش ئەرکەکەی بەجێ‌هێنا، هەر لە سی‌ونودا لەئێستگەدا: کوردی بەشێکی بو کرایەوەو لەگەڵ خوالی‌خوشبو (کامل کاکەمین) هاوکاری‌یەکی تەواوم کرد، ئەوەبو من تا ساڵی ١٩٦٧ هەموو هەفتەیەك گوشەیەکی تایبەتیم هەبوو جگە لە وەرگێرانی هەندێ چالاکی تر.

● ئەی لەگەل نوسین دا چون بوی؟

ـ لە گوڤاری گەلاوێژدا نوسینم هەیە وا ئێستا لەسەر داواکردنی ئێوە جارێکی‌تر دەستم داوەتە وە قەڵەم و لە رەنگینەوە ناوی خوام لێ‌هێناو لە بەیان و هاوکاریشدا هاوکاریم کرد.

● ماموستا ئێوە خاوەن بیرەوەری‌یەکی دەوڵەمەندن، ئایا کارەساتەکەی شەشی ئەیلولتان دێتەوە یاد؟

ـ بەڵێ وەك ئەمرو لەبەرچاومە، ئەهلی سلێمانی یەجاری رژانە بەر دەرکی سەرا دژی هەڵبژاردنەکەی ئەو سەردەمە راوەستان و داوای مافیان ئەکرد، رمزی فتاح و توفیق قەزازو فایق بێ‌کەس هاندەری ئەو جەماوەرەبوون، پێش ئەوە کارەساتە بەمانگێك دیسانەوە خوپیشاندانێکی‌تر رویدا، جعفر عەسکەری‌و هەواڵانی بەردەباران کرا، تایەری برام بوویە ژێر ئوتومبیلی ئەو کار بەدەستانەوە تامرد هەردوو پێ‌ی بە ئیفیلچی مایەوە.

● ماموستا ئایا رۆشنبیری ئەم رۆژگارەمانت چون دێتە بەرچاو؟

ـ ئەمە ئاواتێکمان بوو ئەوە هاتەدی، زمانی کوردی پەرەی سەندوە، سەدەها کتێب و بڵاوکراوەمان هەیە، رۆژنامەو گوڤاری کوردی خزمەتی خویان ئەکەن، ئەدیب و نووسەرانمان زور پێشکەوتون، ئومێدەوارم کوڵ نەدەن و هەست بە ماندوێتی نەکەن و ئەم دەست کەوتە لەدەست نەدەن.

لە دوایی‌دا ماموستای بەرێزمان (کاك عبدالقادر قەزاز)مان بەرێ‌کردو داوامان لێ‌کرد هەمیشە بەسەرمان بکات و گەورەمان بکات و زیاتر لێمان نزیك بێتەوە،



# بەڵگە نامەیەکی مێژوویی

## هیئە تأسیس پەیوەستی نوسەرو وێژەرانی کورد

هیئة تأسیس پەیوەستی نوسەروو وێژەرانی کورد
((رابطة کتاب وادباء الاکـــــــراد))
العدد/ ١
التـــــــأریخ /١٠/ ١٩٥٨

الی : ــ سیادة وزیر الداخلیـــــــــــة
بواسطة سیادة متصرف لواء السلیمانیـــــــة

بواسطة ان اسباب کبت الحریات قد زالت وان اوان حریة الفکر قد ولی واضمحلت وثاق العبودیة والذل بفضل جهد رجال جمهوریتنا الحبیبة الاشاوس فقد سلك كل شیء مسلكه الطبیعی واحس کل مواطن مخلص بان اوان خدمته قد حلت واخذ الکل یشمر عن سواعد الجد لخدمة القطر المحبوب تحت ظل النظام ـ الجمهوری والمحافظة من کیانها وتکوین حلقة طرفة مصقلة الجوانب ومتینة حولها ونحن معشر ادباء وکتاب الاکراد نود من صمیم قلوبنا المساهمة بالخدمة من الوجهة الادبیة والثقافیة وذلك بتوجیه الفتاء الجدید توجیها ادبیا ثقافیا رفیعا یحقق روح العصر ولذا نسترحم التفضل بمنحنا اجازة انشاء رابطة باسم ــ (پەیوەستی نوسەرانو وێژەرانی کورد = رابطة کتاب وادباء الاکراد =) علی ان یکون مقرها مرکز لواء السلیمانیة وذلك عملا باحکام الفقرة/أ من المادة / ٧ من قانون الجمعیات رقم/ ٦٣ لسنة / ١٩٥٥ ونقدم بطیه خمس نسخ من طلبنا هذا مشفوعا بخمس نسخ من النظام الخاص برابطتنا هذا ولسیادتکم الامـــر

احمد هەردی، نوری شیخ صالح، عبدالرحمن بابان، رمزی معروف، فائق هوشیار، شاکر فتاح



احمد شکری، محرم محمد امین، کامەران، محمد صالح دیلان، ابوبکر شیخ جلال، محمد مصطفی کوردی، محمد الخال

هەر لە مێژەوە ئەدیب و نووسەرانی کورد هەوڵی دامەزراندنی دەزگا، یاکۆمەڵە، یا یەکێتیەکیان داوە بۆ ئەوەی بتوانن کاری ڕۆژانەیان بە چاك تر ڕێك تر بخەن، هەر چەندە یەکێتی نووسەرانی کورد لە عێراق دا لە ١٠/٢/١٩٧٠ دامەزراوە بەڵام ئەمە ئەوە ناگەیەنێ کە نووسەری کورد تا ئەو ڕۆژە دەستەوستان دانیشتبێ، بەپێچەوانەوە، هەر بۆنەیەکی لەبار بووبێ داوایان کردووە لێرەدا خاڵێکی گرنگ هەیە ئەویش ئەوەیە کاتێ نووسەران و ئەدیبانی کورد لە سلێمانی داوای دامەزراندنی یەکێتی نووسەرانیان کردووە، هیچ یەکێتیەکی تری مۆڵەت دراو لەسەر تاپای عێراق دا نەبووە بەڵگەشمان بۆ ئەم ڕاستیە نووسراوی وەزارەتی ناوخۆ ژمارە [٢٦٦٧٨٢]ی

● ڕۆژی ١٠/١١/١٩٥٨ دەقی نووسراوەکە دەڵێ

[ الی متصرفیة لواء السلیمانیة
م/ تشکیل رابطة کتاب وادباء الاکراد في السلیمانیة .
کتابکم ٢٧٨١ في ٢٥/١٠/١٩٥٨ .
نود ان نبین بأن هذه الوزارة لم تأذن بأنشاء جمعیة او ناد بأسم اتحاد الادباء العراقیین لذلك نعید الیکم بطیه مرفقات کتابکم المشار الیه
وزیر الداخلیة]

ئەم دەستە مەزنە پیاوانە لە ڕۆژی ١٨/١٠/١٩٥٨دا داوایەکیان لە ڕێگەی متسریفیەتی پارێزگای سلێمانی بە نووسراوی ژمارە [٢٧٩١]ی ٢٥/١٠/١٩٥٨ لەگەڵ پشگیری کردنیدا ناردوتی بۆ وەزارەتی ناوخۆ لە هەمان نووسراودا لە خوارەوەی نووسراوە [ المرفقات عریضه و (٥) نسخ نظام] ئەم بەڕێزانە ئیمزایان کردووە احمد هەردی، نوری شێخ صالح، عبدالرحمن بابان، ڕەمزی معروف، فائق هوشیار، شاکر فتاح، احمد شکری، محرم محمد امین، کامەران، محمد صالح دیلان، ابوبکر شێخ جلال، محمد مصطفی کوردی، شێخ محمد الخال.

هەروەها نووسراوی ژمارە [٣١٢٩]ی ٢٠/١١/١٩٥٨ پارێزگای سلێمانی کە ناردوتی بۆ سەرۆکایەتی شارەوانی سلێمانی کە دەڵێ [.. نعید الیکم بطیه النسخ الخمس من النظام..] بەمەدا دەردەکەوێ کە پێرەوکە گەڕاوەتەوە بۆ شارەوانی سلێمانی خۆزگە ئەوانیش هەوڵیکیان بایە تا ئەو قەبالە مەزنە بدۆزرێتەوە.. وەك تحفەیەکی بەنرخ چاپ بکرێ.. ئەمەش وێنەی داواکەیە کە بە ئیمزای خۆیانە...

● فائق عمر ●

# ئاهەنگە ڕازاوەکەی

## دەزگای ڕۆشنبیری و بڵاوکردنەوەی کوردی







ئێوارەی ١٩٨٨/٧/٢٨ دەزگای ڕۆشنبیری‌و بڵاوکردنەوەی کوردی لە باخچەی بارەگای یەکێتی‌ی نووسەرانی عیراقی ئاهەنگێکی فراوانی سازکرد بەهۆی بیرەوەری بیست ساڵەی شۆڕشی ١٧ - ٣٠ی تەمووزی پێشکەتن خوازەوە.

مامۆستا (مصلح جەلالی) بەرێوەبەری گشتی دەزگای ڕۆشنبیری‌و بڵاوکردنەوەی کوردی بەوتارێکی گرنگ ئاهەنگەکەی کردەوەو کۆمەڵێکی گەورە لە ئەدیب و نووسەرو ڕۆشنبیرانی کورد بەشداری‌یان تێی داکرد.

لەسەر ئاوازی تیپی مۆسیقای (ئەڤین)و (دەهۆڵ و زورنا)ی کوردی هەڵپەرکێ‌و ڕەشبەڵەك دەستی پێ‌کردو سروودی‌نیشتمانی‌و گۆرانی کوردی هەمە ڕەنگ پێشکەش کرا.

لەم ئاهەنگەدا چەند پێشبرکێ‌یەك کرا جوانترین ئافرەت و خاوێنترین کیژۆڵەو چاکترین هەڵپەرکێ‌گەری ژن و پیاو هەڵبژێردرا.

ئەوی شیاوی باسکردنە بەهۆی ژن هێنانی مامۆستا (محمدی مەلا کەریم) هەڵپەرکێ‌و ئاهەنگێکی تایبەتی گەرم کراو کاکە حەمەو خێزانی خەڵات کران و ڕێزیان لێ‌نرا تابێتە نوخشەبۆ هەموولاوێك و بوخچەنەکراوێك و ڕەبەنێك.

ئەبێ ئەوەشمان لەبیر نەچێت کە کاك (مختار فائق) لە پێشکەش کردنی ئەم ئاهەنگەدا فرە ماندوبووو وشەی نایاب و جوانی تێ‌هەڵکێش ئەکردو خەڵات و بەراتیکیشی وەرنەگرت.

ئەم ئاهەنگە شەوێك بوو لەشەوان، تا سەعات دووی دوای نیوەشەوی خایان، هەرگیز لەبیر ناچێتەوە لەناو کۆڕی ڕۆشنبیران...





# میرخاسەکی کو

مێــرخــاســی و زەڤــەری و چەلـەنگی گەلـەك سەرفـەرازیە بۆ مروڤی نەخاسمە ل ڤی دەمی . . دەمی سەربــازێـن مە بەرسـینگێ دوژمـنی دگــرن ل توخیـبێ ڕوژ هەڵات. . گەلــەك ژ کوردێـن مە نیشـانێن مێرخاسی یێت وەرگرتین ئەڤــە ژی مێـرخـاسـەك کوردانـە نیشـانـا مێـرخاسێ یا وەرگرتی. و مەفـەر زانی ئەم ڤێ چاڤ پێکـەتنێ دگــەل بکــەین ئەو ژی [ شفیق حسن عبــدالــرحیم دوسکی] ل سالا ١٩٥٧ ل ناحیــا سەرسنکی ژدایك بویە.

هێژا شفیق دبێژت ئەڤە یازدە سالە ئەز لەشکەرم . . و من بریاردا ئەز بمینم سەربـاز هەتـا دویمـاهیا ڤی شەری و خو قوربانی خاکێ خۆ بکەم. .

خوینـدەڤـانێ هێـژا بچنە دیوانا ڤی مێرخاسی کا دێ بومە چ بێژت . ؟

پ = بۆچی و ژبـەرچی تەنیشـانـا مێرخاسێ وەرگرتیە . ؟

ب ـ ژبــەر من گەلــەك کریـارێن باش کرینــە دشـەرێ مەیێ ڕەوادا دگـەل فورسێ مەجوسی و دگـەل هنـدەك دەست کەفتنا ژبـەر وێ ئێکێ من نیشــانــا مێــرخــاسێ وەرگــرتیـە و ئەڤە بوتە دوو نمونە. نمــونــا ئێــکــێ ل ڕوژا ١٩ ـ ١٩٨٢/٢/٢٠ ل بسێنین ئەز [ ع فصیل] بوم دگەل پەلا خۆ دتابیادا بوین ل سینگێ شەری. .

دوژمــنــی هێــرشــەك مەزن ب سەرمەدا ئینا مەژی بەرسینگێ وان گرت وەك شێـرا مەجـهــێ خو نەبەردا و هەر چار کنارێن مە هاتنە گرتن و ئەم مانە ل هیڤیا هێزامە ل پشتێ بومە هاریکـارێ بهێنـرن و فیشەکێن مە خلاسبون چۆ ددەستێ مەدا نەمـا ئەم شەڕی بکـەین بتنێ چەکـێ سپی [ سلاح الابـیض] و ئەم کەتنــە دنــاڤێــك دا و پاشی سەرکەفتن بۆ یامە و [١٢] ئێخسیر مەژ دوژمـنـی گرتن و پاشی بومــە قوەت هات و ئەو جـحێ دوژمنی گرتین مەژ دوژمنی پاقــژکــرو وێ ڕوژێ ناڤـێ من هاتــە نڤێسین بۆ نیشـانـا مێـرخـاسێ. . . ئو نمونا دوێ ل ڕوژا ٨ ـ ١٩٨٧/١/٩ ل دورویـنا مەزن [ حصـاد الاکبـر] دیسان دوژمنی هێرشەك مەزن ئانی جهـێمــە ئەوان دوشکــەك ژمــە ستاند. ,. سەرلەق دەرچو گوت: حەیف و مخـابن دوشکامە بمینت ددەسـتێ دوژمنی دا و هەمی دەمـا ئەم بســەرکـەتینـە و ما هوین لسەر خو قەبیـل دکـەن دوشکامە بمینت ددەمـتێ دوژمـنی داو سەرلــەقی تبابەکێ ئاخفت و پاشی گوت: من دوو کەس دڤــێــن ئەو خو چانفیدا بکەن و دوشکێ ژ دەست دوژمنی دەرکەن وەکی وێ چت وی دەمــی من هزرەك بر و ئێــك ئانی بەرخێ نێـر ژ کێـرێـرەیە. . ؟ پاشی ئەز دەمــو دەست رابــومــە سەرخو من گوت: ئەزبەنی ئەزێ چمــێ و سەربــازەك دی رابــو سەرخــو گوت : ئەزبــەنــی ئەژی. . ؟ پاشــی ئەم ژ ناڤ سەربازا ڤەدەرکرین و تبابەکێ بومە ئاخـڤــت و هنــدەك شیــرەت ل مەکــرن و ناڤــێ مە نڤـێـســی ژ خوسارەتـا. . چنکو ڕێکا چونێ و نەهــاتـنێــە و مەژی خوپێجــا و مەقەستا دوژمنی چەپەل کر. .

ب زێرەڤانی و ڤەجلسین و جار ل سەر دەستا و جار ل سەر زکیوجار لســەر پشتێ هەتــا ئەم گەهشتین چەپەرێن دوژمنی.

ئەز ل هەڤــالێ خو زڤــریم و من گوتێ تو پشتـەڤـانیا من بکـە و تە شولە ب چ نەبت . . ئەوی ژی وەکر وەکو من گوتی. .

وبچەك دی ژی من خو نێزیك کر پاشــی من ڕێــزەك گولــلا بەردا دوژمــنــی . . من چ پێ نەکــر دوژمنی بەرداُمن ل چەکێ من دا و دەستێ من بریندار بو و چەکێ من شکەست. . چۆ د دەست من دا نەمـا ئان مرن ئان؛ سەرکەفتن. . ؟ پاشی من دەسـدا نارونجـوکەکێ و من بەردا دچـەپـەرێ وانـدا و هەر دوو هاتنە کوشتن. . ؟ و مە دوشکا خو زڤــرانـد و دەست کە فتێن مە دوو کلاشینکـوف. ئێـك قونتـاخ ئاسن و یادن قونتاخ دار بون. پشتی ئەز ژ خەستەخانێ دەرچوێم نیشانا مێرخاسێ دا من . .

● محمد ئوسمانا ●



# دەستی نەرمیش لە ئاوەدانیو پێشکەوتنی وڵاتدا بەشداری دەکەن

زور توانستی بەرز لە کوری لێکولێنەوەی زانستیدا «مجلس البحث العلمي» دروشمەکانی تاقیکردنەوەی زانستی ولات وینە دەکیشن. ئەمانەش بە پیاوو ژنەوە تەنیا بە خەم بەهرەنواندن و بەخشش.

لە نیوان کومەلێك لەزاناکانمان دا کچێکی زیرەك سەرنجی راکیشاین کە بە هەنگاوی چەسپاو ریگەی زانستی خوی دەبریت و سەرکەوتن وەدەست دەهینی، کە کردارەکانی بوونەتە مایەی سەرنج و هەر لەئیستاوە پایەی شیاوی خوی لە مەیدانی زانیاریدا دەگریتەوە، ئەویش ئەندازیکی کوردە بەناوی نایاب طاهر دەباغ.

رەنگین: پێش ئەوەی بینە سەر باسی کاروپیشەکەت ئەگەر زەحمەت نەبێ حەزدەکەین بت ناسین.

نایاب: لە زانکوی تەکنولوجی / بەشی ئەندازەی ئاواکاری «هندسەی میعماری» سالی ١٩٨٤ دەرچووم و وا سێ سالە لیرە لە «کوری لێکولێنەوەی زانستی» بەشی ئاواکاریو ژینگە «عمارة وبیئة» - ناوەندی لێکولێنەوەکانی بیناسازیدا کاردەکەم، هەول دەدەم باس و لێکولێنەوە لە گوڤارە تایبەتەکان دا بلاوبکەمەوە.

رەنگین: داخوا کارەکەت چونە؟

نایاب: کارەکەم لەم بەشەدا بریتییە لە لێکولێنەوەو باس نووسین، تا ئیستاش دەربارەی یەك بابەت، چوار لێکولێنەوەم تەواوکردووە بەناوی «نەخشە پێوانەییەکان و مەرجەکانی بەکارهاتنی کەلوپەلی باخچەی ساوایان و قوتابخانە سەرەتاییەکان» لە دوو بەش دا. هەروەها «نەخشە پێوانەییەکان و مەرجەکانی بەکارهاتنی کەلوپەلی دایان خانەکان» کەوا لە ئەنجامی ئەم لێکولێنەوانەدا پێوانەکانی لەشی مندالی عیراقیو قوتابیی عیراقی لە قوناغەکانی باخچەی ساوایان و قوتابخانەی سەرەتاییو ناوەندیو ئامادەییدا بە کورو کچەوە پوختەکراو لەسەر بناخەی ئەم لێکولێنەوانە لەگەل ناوەندی نەتەوەیی راوێژکارییە ئەندازەییەکان دا «المركز القومي للاستشارات الهندسية» ریك کەوتین، کەوا بەپێی پێوانەکانی ئیمە کەلوپەلی قوتابخانە دروست بکرێت.

رەنگین: بوچی ئەم باسەت هەلبژارد؟

نایاب: ئەو کەلوپەلانەی لە قوتابخانەکان دا بە کاردە هێنرێن نەك لەسەر بناخەیەکی زانستانە، بەلکو بە پێی بوچوون و رای تایبەتی دروست کراون، سەیرم کرد بو دانیشتن و هەلسوکەوتی قوتابیان خوش نین، بەلکو کارێکی خراپ لە بربرەی پشت و لەلەشی قوتابی دەکەن، بە تایبەتی کە ئەوەشمان زانی قوتابی نیوەی روژی خوی لە قوتابخانەدا بەسەردەبات و لەو تەمەنەش دا لەشی شل وملەو روژ بە روژ لە پێگەیشتن دایە ئەودەم هەست بە مەترسیی ئەم حالەتە دەکەین.

رەنگین: کارێکی باش و بەکەلکە، لێرەدا پرسیارێك بە خەیالم دا دێت، ئایا پشتت بە تاقیکردنەوەی لەم جورەی ولاتانی عەرەب یان جیهان بەستووە؟

نایاب: لە رووی جیهانییەوە، لەبەر ئەوەی پێوانەکانی مروڤ لە

* ئیلهام *

ولاتیکەوە بو ولاتیکی تر جیاوازن بۆیــە بۆ ئیمــە سوودیـان نابێت، وەکو بش زانم عیراق لە پێشەوەی ئەم ولاتــە عەرەبیـانـەیە کە بایەخی بەم بارە داوە.

**رەنگـیـن: بۆ پەرەپـێـدانـی توانـــا، ئایـــا هیـــچ خولـــی خوێندنت دیوە؟**

نایاب: بەڵێ، لە هوڵەندە خولێکی خوێنـدنی شەش مانگیم تەواوکـرد دەربـارەی نیشتــە جێ کردن لە ولاتـانی دنیـای سێـیـەم دا، کە گەڕامـــەوە عیـــراق زۆر پرۆژەو بیـرولێکدانەوەی هەمەجۆرم لەگەڵ خۆدا هێنا.

**رەنگین: باشــە، ئێستــا بە چ پرۆژەیەکەوە خەریکیت؟**

نایــاب: ئێــســتـــا خەریــکـــی لێکـۆڵینـەوەیەکم لەبابەت شێوازی چاك کردنی خانوو دروست کردنی شێـوەی جاران، باسی چۆنیــەتی خێـرا تەواو کردن و هۆیــەکـانی دواکـەوتنی دەکەم. نیازیشم وابوو چوار لێکۆڵینەوەکەی پێشووم تەواو بکـەم و باسی پێوانـەکـانی دوای قۆنـاغی ئامـادەیی و لەشـی پەك کەوتەکان بکەم و ئەم بابەتەش زۆر بەگرنگ دەزانم.

**رەنـگـیـن: بەو پێـیـە کە تۆ ئەنـدازیاری ئاواکاریت، ئایا هونـەری ئاوا کاری لە عیراق دا بەرای تۆ وەکو یەك وایــە؟ یان جیــاوازەو لە باکووری عیراق فەرقی هەیە لەگەڵ ناوەراست وخواروودا؟**

نایـاب: بینـاسـازی لە باکـووردا رەنگی لە سروشت وەرگـرتـووە، گەلـی کورد لە خۆرسـکـەوە هونـەرمـەنـدە، ئەمەش ئاشکرا لە جۆری جل وبەرگیاندادیارە، کەوا لەیـەك کات دا رەنگـاو رەنگ و تیـرەرنگ و جۆراو جۆرن، بەلام هەمـووشیــان لەیـەك شت دا کۆدەبـنـەوە ئەویش لاسـایـی کردنەوەی سروشتە.

بەلام تێبینییەکم لەم لایـەنەوە هەیـە، کەوا بیناسازیی عیراقی لە رووی پەلوپۆو بەشـەکـانییـەوە تارادەیەك هاوجۆرە، کەوا حەوشە لە ناوەنـدی ماڵەو ژووری تایبەتی بۆ میوان تەرخان کراوەو هەر ماڵە باخچـەی خۆی هەیـە. بیناسازیی عیراق یەکـەر هەستی جیاوازی بە بینــەر نادات و وا نازانیـن کە لە شوێنێکــەوە چووینـەتـە شوێنێکی تر، بەنـمـوونـە هەتـا لە قەڵای کەرکووکیش دا حەوشە هەیە.

جیـاوازی زیـاتـر لە کەرەستەی ئاواکـاریـیـە، کەوا ناوچــەی کوردستــان بۆ دیـوار بەرد بەکـار دەهێنن و بەردیش بە تاقیکـردنـەوە دەرکەوتووە کە ئێجگار بەرهەڵستی بەهێـزەو توانـای دەنگ برو گەرماو سەرما بریشی زۆرە، بەکار هێنانی ئاســانـە چونکـە زۆرەو دوورە دەست نییە.

**رەنـگـین: دواجـــار، ئاوات دەخوازین لە ئیش و کارت دا هەر سەرکەوتوو بیت.**




گەلێــك خونچــەی گەش، لێـرەو لەوێ، دەمی هیـوایـا بۆ پاشـەڕۆژ دەکــەنـەوە... کە پێـویستیـان بە دەست گرتن هەیـە... بەتـایبەتی مـنـالان... کە گەلـێـــك جار خۆزگەو ئاواتیان گەورەترە لە خۆیان.

- زهیـــر سعـــدون - منــاڵـێکی هونــەرمــەنـــدەو تا ئێستـا لە زۆر بەرهـەمی تەلـەفـزیونی و شانۆیی دا بەهرەی ناسکی خۆی نواندووە... کە سەلیقەی ئەم منالە ناسکە ئەنوێنێ.

● کاکە زهیر.. رۆژباش.

- رۆژباش.

● چۆن و کەی چوویتــــە ناو دونیای پاکی هونەرەوە؟

- خێـزانـەکـەمـان هەر هەمـوویان هونەرمەند ن، باوکم، دایکم، خوشکم.

● بەرهەمەکانت چین؟

- وەکو شانۆ چین

١ - گوڵـی نهێنـی - دەرهێنـــانی لطیف نعمان.

٢ - قەڵای دمدم - سعدون یونس.

● ئەی تەلەفزیۆن؟

- گەرەکــەکــەمـــان، مالـــەی سەرگــردەکــە، قاســپــەی کەو، کۆلارە، کە زۆربەیان، دەرهێنانی مامۆستاو باوکم سعدون یونس.

● حەز لە، چ دەورێك ئەکەی؟

- ئەوەی کە لەگەڵیدا ئەژیم.

● ئەی خۆشترین دەورت؟

- لە تەمسیلیەی تەلەفزیۆنی کۆلارە...

● هیوات؟

● پەیمانگای هونەرە جوانەکان.

● ش. ع. هەولێر ●



سەر دانێکی کورت:

# بەسەر کردنەوەی ماموستا ماموستام

# انور قەرەداغی

که چومە دیدەنی ماموستای هونەرمەند ماموستام «أنور قەرەداغی» ، له ماڵە رازاوەو هونەرو رەنگینەکەیدا هێندە هونەری بەرزی ماموستام بینی ، نازانم له کوێوە دەست پێبکەم ، خوێنەری رەنگین، بەو جیهانە تایبە تیەی هونەرمەند زیاتر ئاشنا بکەم وەك لەوەی بینویانەوە، لەسەر ماموستایان خوێندۆتەوە. خێزانەکەیان که له (٥) کەس پێك هاتون ، هەر لە« کاوان»ەوە، که بچوکترین خونچەی ماڵەکەیە، خوشەویستی هونەرن. جێگای داخە، که دایکی تارامان نەبینی ، لەو کاتەی ئێمە چووین له ماڵ نەبوو، بەڵام چەند پرسیارێکمان بۆ بەجێ هێشت، بەرێزەوەوەلامەکانی بۆناردینەوە. وا ئێمەش جارێکی تر لەگەڵ ئێوەدا دیدەنیان دەکەین.

■ کاك أنور چۆن بەموسیقا ئاشنا بوویت.

- له ساڵی ١٩٦١ وە، خەریکی موسیقام، ساڵی ١٩٦٤خۆم ناسی بەوەی کەتوانایەکی باشم لەخۆمدا بەدی کرد، بۆ کاری هونەری موسیقا.

■ هیچ ئاموزگایەکی هونەریتان تەواو کردوە؟

- دەرچووی قوتابخانەی ماموستایانم، ٦٣ - ١٩٦٤ لە سلێمانیبە پلەی یەکەم، هیچ ئاموزگایەکی هونەریم تەواو نەکردوە.

■ ئەی خولی موسیقاتان نەدیوە؟

- خولی موسیقا وەك ماموستا وانەم تیاوتوتەوە، لەم ساڵانەی دوایىدا زەمالەیەکی راهێنانم له تورکیا دی ، که «٣٣» رۆژی خایاند بەپلەی ئیمتیاز تیایدا سەرکەوتم.

لەم کاتەدا «ئالان»ی کوری چەند ئەلبومێکی بۆ هێناین که تایبەت بوو ،بە ئەرشیفی تایبەتی ماموستای هونەرمەند.

وا دیارە کاك ئالان حەز دەکا بەشداریمان لەگەڵ بکا، ئێمەش حەزدەکەین، گفتوگۆی لەتەك بکەین.

■ رۆژێ لەرۆژان ئارەزووی ئەوەت کردوە لەسەر خۆت بنوسی؟

- لام وایە هەرکەسێ سەرکەوتوو بوو له کارەکانیدا پێویستە تاقی کردنەوەی ژیانی بخاتە بەرچاوی خەڵکیتر ، نەك تەنها بۆ پیشان دان بەڵکو بۆوەرگرتنی تاقیکردنەوەی ئەو کەسە، را دەزانم لەژیاندا تاقی کردنەوەی زۆرم دیوە، بەپێویستی دەزانم بتوانم بیخەمە بەرچاوی خەڵکی سودی لێوەربگرن.





■ بەسەرتا هاتووە ، نوتەیەك پاش نوسینەوەی بیدڕێنی؟

- شتێکی ئاسایی یە چ ئەدیب و چ مۆسیقاژەن، بیرکردنەوەیەك بنوسیٚ‌و لە پڕ لەخاڵێکدا بوەستێ، ئەوەی پێشوی بسڕێتەوە، حاڵەتێکی بەسەردابێت ، نەك ووەقە بدڕێنێ تەنانەت قەڵەمەکەی دەستیشی فڕێبدا ، چەندەها جار ئەم حاڵەتەم بەسەردا هاتووە، نەك لە نۆتە نوسینەوەدا ، بەڵکو لە نووسینی باسی مۆسیقاش دا.

■ ئەی چ جیاوازیەك لە نووسین و دانانی مۆسیقادا دەبینی.

- کاك ئازاد ئەم پرسیارە زۆر ئاودەکیشێ ، چونکە وەلامێکی درێژی دەوێ ، ئەوەندە دەڵێم هەر بابەتە خاڵی تایبەتی خۆی هەیە.

■ رات چی‌یە لە رەخنەی خەڵکی؟

- هەمیشە گوێم شل دەکەم بۆ هەموو رەخنەیەك، بەمەرجێ رەختەیەك بێت هەنگاوم پێ‌بنێت، خۆ ئەگەر رەخنە لە کارەکەم بێ، پێم خۆشە رەخنەگر لەنزیکترەوە بمناسێ نەك لەسەر پەراوێز رەخنەم لێ‌بگرێ، بۆنموونە رەنگە بڵێن أنور قەرەداغی کەس فێرناکا، بەڵی حەزدەکەم یەکێك فێرکەم کەبەردەوام بێت لەسەر ئەو کارە هونەری‌یە ، ئێستاش، پتر لە دەیان قوتابیم هەیەکە ئاواتێکی گەورەم، پێیانە، بەڵام گەر هەندێ دەیانەوێ بۆ خۆهەڵکێشان فێریان بکەم ئەوا من تاقەتی ئەو جۆرانەم نی‌یە، با بەیانی تا ئێوارە رەخنەم لێ‌بگرن.

■ لە ئامێری مۆسیقا چەند ئامێر بەکاردەهێنن..

- تەنها لە ئامێرەکانی مۆسیقادا لەگەڵ ئامێری (کەمان) دا دەست لەملانین، بەڵام وەك پێویستی رۆشنبیری‌و ئاوازدانان لەهەندێ ئامێری تردا شارەزایم هەیە ئەگەر لەرووی پراکتیکەوە نەبێ لەرووی تیوریەوەیە.

■ مامۆستا بابێینە سەر باسی گۆرانی‌و مۆسیقای کوردی، کە ئەمڕۆ هەندێ گرێ کوێرەی تێ‌ئالاوە، پاشان لەگۆرانی‌دا هەست بەدڵتەنگی دەکەین، ئێوە بۆ ئەم دوو باسە دەڵێن چی؟

هیچ گۆرانی‌یەك دڵتەنگتان دەکات!!

- گۆرانی‌و مۆسیقای کوردی کە گرێ کوێرەی تێدایە، دەگەڕێتەوە بۆ هونەرمەندو کۆمەڵ و لێ پرسراوان، کە بەهونەرمەند ڕاست دەکرێتەوە. لە دەزگاکانی ڕاگەیاندن ڕادێو تەلەفزیون و کاسێت بڵاوبکرێتەوە. بۆ شەقلی دووەمی پرسیارەکەش کە مۆسیقاو گۆرانی زمانی دەرونی میللەت بوو، ئەوا رەنگ دانەوەی باری دەرونی کۆمەڵ دەردەخات، بەڵام نابێ ئەو بار (کئابە) ی تەواو هیوا بری بەسەردا بێت، من حەزم لەو جۆرە گۆرانیەیە، حەزم لە خەمناکی رووت نی‌یە. چووینە ژووری ستودیۆی کاك أنور، کەتیایدا کارە هونەریەکانی مکساج و مونتاژو تۆمار کردن جێبەجێ دەکات، ئەم ژورە مامۆستا خۆی ئامادەی کردوە هەروەکو ستودیویەکی گەورە کارەکانی تیا مەیسەر دەکات. بەڵام پێش ئەوەی باسی ئەو کارە هونەری‌یە بکەین ، با بزانین کاك ئالان کە قوتابی پۆلی شەشەمی سەرەتایی‌یە

«۱۸» هەژدە ساڵە کەمانچەکەی هاوەڵێتی.

لە ستۆدیوی ماڵەوە مکساج و مونتاژ دەکات.

**لە نیسنکەو سەلەمر یون دا.**

**کوراس نایبس بومار کردوە.**



چالاکانەدەبینم لەوکاتەی لێرەین گوێرایەڵ ئاگادارمانە. چی دەڵێت:ـ

■ کاکە ئالان: لەوانەکانتا چۆنی

ـ زۆر باشم بەپلەیەکی باش سەرکەوتنم هێناوە.

■ مۆسیقا دەزانن.

ـ بەشی خۆم، کەمێك لەگەڵ ئامێری (سایزەر) خەریکم.

■ حەز لەچی‌تر دەکەیت ؟

ـ کاری زانستی.

■ پاشە ڕۆژ !

ـ حەزدەکەم پلەکانی خوێندن تەواو بکەم.

■ کە باوکت لەسەر شانۆ یا تەلە فزیۆن دەبینی هەست بەچی دەکەیت؟

ـ هەست دەکەم مرۆڤ دەبێت هەمیشە کوڵ نەدات بۆ ئەوەی بگاتە ئاوات.

■ یارمەتی باوکت دەدەیت لەکارە هونەری‌یەکاندا؟

ـ بەڵێ زۆر جار لەم ژوورەدا ، لە کاری تۆمار کردن و مکساج و مونتاجدا پشتم پێ‌دەبەستێ منیش بەم کارە زۆر دڵخۆش دەبم.

■ زۆر جار وەك ڕابەرێکی مۆسیقا دەت بینین؟ ئایا پەیوەندی دەرونی چی‌یە لەو کاتەی کە ڕابەری مۆسیقاژەنەکان دەکەیت؟

ـ بەڵێ زۆر جاروەك کاری ڕابەری کاردەکەم کەهیچی لەمۆسیقا لێ‌دانەکە کەمترنی‌یە، ڕابەری لایەنی دەرونی ئاوازی مۆسیقایان گۆرانیەکە یەك دەخا لەکاتێکی دیاری کراودا، کە دەرونی ڕابەرەکە. دەست نیشانی دەکات لەبەر ئەوە دەبێ ئەو لایەنە هەستی‌و دەرونیانە بگەیەنێتە ئەو مۆسیقاژەنانە، بۆ دەربڕینی مۆسیقاژەنەکانیش لە ژێر ئەو ڕابەریەدا ئەو لێ‌دانە دەربڕن. گەر وانەبێ ئەوا کارێکی «شکلی‌یە » باشترین نمونەش کەتێك لەسەر بناغەیەکی زانستی ڕابەری تیادا کرا، ئەوا هەمان تیپ بەبێ ڕابەری ڕەنگە وەك پێویست ئەو بەرهەمە نەیەتە دی، لە ژیانی هونەریما زۆرم لەو حاڵەتانە دیوە.

# باوکی «تاراو ئالان و کاوان»ە

■ باشە مامۆستا لەمۆسیقادا! هەست بە پاڵەوان دەکرێت!؟

ـ ئەگەر بەڕاستی وەڵامی ئەم پرسیارە بدەمەوە ئەڵێم بەڵێ پاڵەوان هەیە، بەڵام ئەمە لەکوردەواری‌دا (نسبی‌یە)، هەرکەسە لە بیرکردنەوەی خۆی داو لەو پلەیی تیابدا ... خۆی بە پاڵەوان بزانێ، بەڵام گەر لە دەروازەی زانستی‌یەوە سەیری بکا پە شیمان دەبێتەوە. چونکە زانستی مۆسیقا زانستێکی قوڵ و بێ‌بنە، هەر چەندە هەوڵ دەی کۆتایی نایەت. سەبارەت بەکاری خۆم وابزانم هێشتا لەسەرەتادام.

■ لە مۆسیقا لێ‌دانی یان ئاوازدانان، لاسایی کەستان نەکردۆتەوە؟

ـ نەخێر تەنها خۆم بەقوتابخانەی مۆرکی کوردی دەزانم بەشێوەیەکی هاوچەرخ.

■ بنەماڵە ئاینیە کەتان، لە ئاوازەکانتا ڕەنگی داوەتەوە؟ دەڵێن چی!

ـ بەڵێ چەندەها ئاوازی ئاینیم داناوە هەندێکیش خۆم وتومەو تۆمارم کردوە لە ڕێستگەو تەلەفزیۆن، ئەمەش بە ئەرکێکی گەورە دەزانم.

■ لەم دوایی‌یەدا کۆڕاڵێکتان پێش کەش کرد، «طقسێکی، تایبەتی وەرگرتبو. لێرەدا ئەمەوێت بپرسم ئێوە شیعر پێش ئاواز دەخەن یان بە پێچەوانەوە!؟.

ـ وەك مامەڵەکردن، هەر دووکی ئەگونجێ‌و ئاوێزکردنی هەردووکیشیان هەر دەشێ، بەگشتی لەم دوایی‌دا هەوڵی ئەوە ئەدەم بیرکردنەوەکەم بۆشاعیر نیشان بدەم و شاعیر هۆنراوەکە دانێ‌و ئاوازی بۆ دانێم، لەکاتی ئاوازدانانیشیدا ماوەی دەستکاریم هەبێ لەگەڵ شاعیرەکەدا، بۆگونجانی باری ئیقاعی یان جوانی یان پێویستی ئاوازەکە.

■ ئێستا کە مامۆستای پەیانگای هونەرە جوانە کانی سلێمانی، دەستی سەرکەوتووی دەنێیتەسەر کام قوتابی.

ـ بەگشتی هەموویان بەسەرکەوتو دەزانم، بەتایبەت قوتابی عبداللە جمال، نوزاد محمد، سوران محمد کەمان ژەن ـ لاوك لطیف و بەختیار حمەکریم، ناسك حسن و شوان احمد ئۆکوردیۆن ژەن. نەریمان محمد چەلۆژەن و چەندانی تر.

■ چەند ئاوازت هەیە ؟

- ژمارەیەکی زۆر ڕەنگە نەتوانم ئێستا دەست نیشانیان بکەم، هەروەها زۆر گۆرانی و مۆسیقاشم ئامادەو دابەش کردوە بۆ هونەرمەندو گۆرانی بێژ، لە ساڵی ١٩٦٤وە هەتا ئێستا.

■ یەکەم ئاوازت ناوی چی‌بوو؟ کەی بوو ؟

- گۆرانیەکی منداڵان بوو ساڵی ١٩٦٤ ، بۆ قوتابیانی تطبیقات ( پێشکەوتنی ) ئێستا لە سلێمانی بەناوی (کەژ ) دام ناوە. پاشان چەند ئاوازێکی تریشی بەدواداهات.

■ دوا بەرهەمت !؟

- کۆراڵی (خەمێك وخەونێك) لەهۆنراوەی شاعیری بەرز حسیب قەرەداغی، لەگەڵ تیپی مۆسیقای پەیمانگەی هونەرە جوانەکانی سلێمانی لەڤێستڤاڵی ساڵانەدا پێش کەشمان کرد.

■ تا ئێستا خەڵات کراون.

- بەڵێ چەندەها جار خەڵاتم وەرگرتوە، لەو ڤێستڤاڵانەی کە کراون، چەندەها جاریش ڕێزم لێنراوە لەلایەن لێپرسراوان و کاربەدەستان و هونەردۆستانەوە.

کاك أنور ئەم پرسیارانە بەکورتی :-

■ ڕاتان بەرامبەر بەم هونەرمەندانە :-

صلاح رؤوف، خالدسەرکار ، فرنسیس داود، اسعد قرەداغی، محمد امین حسین، وریا احمد، ودڵشاد محمد.

- هەموویان بەڕاستی هونەرمەندن و هەریەکە جێگای خۆی هەیە لەدڵی جەماوەرو لەپەرەی هونەری کوردی‌دا ناویان نەخشێنراوە، خاوەنی بیرکردنەوەیەکی جوانن، بۆ ڕێڕەوی هونەری مۆسیقای کوردیمان.

■ نەوەی دوا ڕۆژ چۆن دەبینی؟



- هیوادارم لەسەر بناغەیەکی زانستی هونەری مۆسیقا فێربن و بزانن چۆن خزمەتی میللەتەکەیانی پێبکەن و دوورکەونەوە لە کۆڕی پوچ و بێ‌سوود.

■ دەڵێن لەکاری هونەری‌دا تورەی! وایە؟

- تورەبوونەکەم لەبەرژەوەندی کارەکەدایە.

■ خۆشترین کات؟

- کەهەر بەرهەمێکی ڕێك لە دایك دەبێ، جا بەرهەمی خۆم بێ یان بەرهەمی برادەرانم.

■ ناخۆشترین کات.

- کە کارێکی هونەریم بەزۆر بەسەردا بسەپێنن و دەسەڵاتم بەسەری‌دا نەبێ...!

■ ئەو پەندەی بڕوات پێ‌یە ؟

- وتەی گەورەمان (ئیمامی علی ) کە دەفەرموێ :-

اعمل لدنياك كأنك تعيش ابداً
واعمل لآخرتك كأنك تموت غداً

■ دەنگەکانی مۆسیقا کامیانت پێ‌خۆشە؟

- دەنگی « لا » لەهەموو چینەکانی دەنگگ دا.

■ گۆڤاری «ڕەنگین» ؟

- گۆڤارێکە هەنگاوی پیرۆزتری دەوێت، تا وەکو زیاتر لەدڵ و دەروونی خوێنەرانی‌دا جێگای خۆی بکاتەوە، دیارە پێوستی بەکادیری تایبە تیشە بۆ ئەو مەبەستە، ئاواتە خوازم ڕەنگینی خۆی زیاتر بنەخشێنی‌وببێتە گوڤارێکی هەفتانە.

■ مامۆستا سوپاست دەکەین، حەزمان کرد چەند پرسیارێك ئاراستەی کچە گەورەی بەڕێزتان بکەین. هەر چەندە خوشکە تارا خەریکی پیاچونەوەی وانەکانێتی، بۆ تاقی کردنەوەی کۆتایی ساڵ.

-کاکە خۆتان چۆنی بەباش. ئەزانن فەرمون.

■ «تارا خان ئەمە تاقی‌کردنەوەنی‌یە، بۆ ئەوەی زۆر کاتیشتان لێ نەگرین، بەکورتی وەڵامان بدەرەوە.

- بەسەرچاو.

■ لە چ قۆناغێکی خوێندن دای؟

- ئامادەیی، پۆلی پێنجەمی زانستی.

■ چۆن بیر لە خێزانی هونەری خۆتان دەکەیتەوە.

- لەوەتی فامم کردۆتەوە، لە نێوان خێزانە کەماندا، لقەکانی ڕۆشنبیری برەوی زۆرەو بەتەنگی‌یەوە هاتووین لەم لایەنانەش هونەری مۆسیقاو ئاوازە کە بەهەمو دەرونێکەوە لەگەڵیدا دەژین.

■ لەگەڵ هیچ ئامێرێکی مۆسیقا ئاشنایەتیتان هەیە؟

- بەڵێ تا پلەیەك بە ئامێری «سایزەر» ئاشنام.

■ خۆتان بۆ هیچ لایەنێکی هونەری ئامادە نەکردوە؟



## هێندەی مۆسیقا حەز لەنووسین دەکات

- هەر چەنــدە زۆر حەزیشــم لە هونـەری مۆسیقـایـە، بەڵام زیـاتر ئاوێزی وانەکانمم.

■ کەواتە لەوانەکانتا چۆنی !

- زۆر باشم بەڵام باوکم زیـاتـری دەوێ کە زیرەك تربم.

■ پاشە ڕۆژ نیازی کوێتان هەیە!

- پشت بەخـوا حەزدەکـەم یان ببم بە پزیشك یان ئەندازیار، بەڵام لەڕاستیدا نمـرەکانم بەپێی ئەوکاتە دەزانێ.

■ ئێوە خێزانێکی ناسراوون. لە ناو خەڵـکـیدا کەبـاسـی باوکت دەکەن هەست بەچی ئەکەیت؟

- هەست بەلێهـاتـوویی و گەورەیی باوکم دەکـەم ئەوەنـدەی من باوکم دەناسم زۆر زیاتریشە لەوا باسکردنە.

■ زۆر سوپاس .

- منیش زۆر سوپاس

ئەمەش وەڵامی ئەو پرسیارانەی بۆ بەڕێز دایکی تارامان بەجێ هێشت:-



■ ئێسـتـا خەریکی چین، پلەی خوێندەواریتان ؟

- دەرچـووی خانەی مامۆستایانم، ئێستاش مامۆستای قوتابخانەم.

■ حەز لە مۆسیقا دەکەن؟

- وەك گوێ گرتـن. ئارەزوم لە مۆسیقای ڕێك و پێکە.

■ کە ناوی مامـۆستـا أنـور دەبیستیتـەوە، زیـاتـر چی دڵخۆشت دەکا؟

- زیـاتـر ئەوە کامەرانم دەکات کە نزیکترین کەس بەمن لەمـەیدانی هونـەری مۆسیقـای میللە تەکـەی دایـە بۆ خزمـەتی گەل بەهـەمـو گیانێکی لێبوردن و پڕئارام و خۆڕاگرتنەوە.

● ئازاد - ئامادەی کردوە ●
کاردۆ - وێنەی گرتوە

لەگەڵ ٥ نووسەرە ناودارەکانی جیهان دا:

# نهێنی و هەواڵی سەیر لەژیانی

## نووسەرە ناودارەکانی جیهاندا



جان جاك روسو ١٧١٢ - ١٧٧٨

کاتێك لە سەرچاوە هەمەجۆرەکانی ئەدەبی جیهانی دا، بە دوای مێژووی ژیانی نووسەرە ناودارەکان دەکەوین, ، لە ژیانی تایبەتیو ئەدەبی ئەوانە ورد دەبینەوە، گەلێك نهێنیو هەواڵی سەیرمان بۆ ئاشکرا دەبێت کە لە ماوەی ژیانی ئەو ئەدیبە گەورانەدا روویان داوەو کاریان کردوتە سەر ڕێرەوی ژیانی ئەدەبییان و، لەبەر خۆشیو سەیرییان لێرەودوا دەیان خەینەروو:

١) شەکسپیر (١٥٦٤- ١٦١٦):

شانۆنامە نووس و شاعیری ناوداری ئینگلیز، لە شاری ستراتفورد لەدایك بووەو، لەوێش - دا ژیاوە، تاکو بە تاوانی دزی کردن تاوانبارکراوەو هەرچەندە ئەو کەسانەی تاوانباریان کردووە نەیان توانیوە چ بەڵگەیێکی لەسەر بدۆزنەوەو لە گرتووخانە ئازاد کراوە، بەڵام لەو ڕووداوو کارە ناڕەوایە دڵی شکاوەو شارە بچکۆلەکەی خۆی جێهێشتووە و ، تا نەچوتە شاری (لەندەن)ی پایتەخت و نەبووە بە ئەندامێکی [ تیپی نواندنی پیاوانی مەلیك] کە لە شاژنی بەریتانیا ئەلیزابێث ( ١٥٨٨ - ١٦.٣ ) نزیك بوون و هەموو یارمەتییەکیان لێوەردەگرت، ئەدیب و شانۆنامەنووس ، نەبوو بەم شەکسپیرە ناودارەی کە لە هەموو گۆشەیێکی جیهان دا ناوبانگی گەورەیی بڵاوبێتەوەو ئەمڕۆ پتر لە نیو ملیۆن کەس لە بڵاوکەرەوەی بەرهەمەکانی و خاوەن کتێبخانەو مامۆستاو فەرمانبەرانی مۆزەخانە، ڕزق و ڕۆژییان بە هۆی بەرهەمە ئەدەبی یە نایابەکانی شەکسپیرەوە وەدەست دەهێنن.

٢): جان جاك رۆسۆ (١٧١٢ - ١٧٧٨):

فەیلەسووف ونووسەری ناوداری فەرەنسا، خاوەنی کتێبی (ئەمیل) لە پەروەردەو (پەیمانی کۆمەڵایەتی) لە سیاسەت و کاروباری کۆمەڵایەتیدا، هاوچەرخەکانی گەلێ نهێنیو هەواڵی سەیریان لێ ئاشکرا کردووە، یەك لەوانە ئەمە بووە: ‹ رۆسۆ لە ژیان دا گومانی لە هەموو کەسێك و لە هەموو شتێك کردووەو، وای زانیوە هەموو ئادەمیزادێك دوژمنێتی و هەموو شتێك لە دژیەتیو, ، تەنانەت گرمەی هەوررو برووسکەش لە دژی ئەو دروست دەبن، جگە لەمەش، خواردنی دەستی کەسی نەدەخواردو، وای دەزانی چێشت لێنەرەکەی لە کاتی ئامادە کردنی دا ژەهری بۆ تێدەکات بۆیە تەنیا ئەو خواردنەی دەخوارد کە بە دەستی خۆی دروستی دەکرد!!



شه كسپير ١٥٦٤ - ١٦١٦

٣). بەلزاك (١٧٩٩ - ١٨٥.):

بەلزاکی نووسەری ناوداری فەرەنسا، ئەوەندە نووسەرێکی بەتوانابوو لە ڕۆمان نووسین دا، بەر لەوەی تەمەنی بگاتە ٢٣ساڵ توانی ٦ ڕۆمان بنووسیو لە نێوانی ساڵانی ١٨٣١ - ١٨٤٢ دا ٧٩ ڕۆمانی سەرکەوتوو پێشکەش بە دنیای ئەدەب کردو، لە بڵاوکردنەوەیان پارەیەکی زۆری لێ چنگە کەوتن، کەچی لەبەر دەست بڵاوی، تاکو لە ژیان دا بوو، هەر بە قەرزداری ژیاو تەنانەت لە دەرکە لێدانی ماڵەکەی خۆی دەترساو، نەی دەکردەوەو، دەیگوت دەترسم خاوەن قەرزەکان بن و ، داوای قەرز دانەوەم لێبکەن!!

٤). مەکسیم گۆرکی (١٨٦٩ - ١٩٣٦):

چیرۆك نووسی ناوداری ڕووس لە ماوەی ژیانی دا گەلێ کێشە و بگرەو بەردەی دیوە، جارێکیان پۆلیس دەیگرن و دەیبەنە بەردەم ئەفسەرەکەیان، ئەویش کە لە ئەنجامی لێکۆڵینەوە بۆی دەردەکەوێ کێیە.لێی دەپرسی:

- تۆی نووسەری ئەو چیرۆکانەی کە بە ئیمزای (گۆرکی) لە گۆڤارو ڕۆژنامەکان دا بڵاودەکرێنەوە؟

ئەمیش دوای کەمێك دامان و بیرکردنەوە، وەڵامی دەداتەوەو دەڵێ:

- بەڵێ منم گۆرکی!

ئەفسەرەکە پێی دەڵێ:

- کەواتە چیرۆکێکم بۆ بنووسە، من لە گرتووخانە بەرت دەدەم!

گۆرکیش پاش کەمێك بێدەنگی دەڵێ:

- باشە بۆت دەنووسم.

هەر ئەو شەوە گۆرکی چیرۆکێکی کورتی بۆ دەنووسیو بۆ بە یانی دەیداتیو ئەفسەرەکەش ئازادی دەکات.

سەیر ئەوەیە دوای سێ ڕۆژ گۆرکی لەیەکێ لە ڕۆژنا مەکان دا چاوی بە چیرۆکەکەی خۆی دەکەوێت، بە ناوی ئەو ئەفسەرە بڵاوکراوەتەوە کە بەری داوە! گۆرکی بەم کارەی ئازادی وەدەست هێنا، کەچی کابرای ئەفسەری پۆلیس بەو کارەی هیچ ناوبانگێکی وەدەست نەهێنا، چونکە نووسەر بە تاکە چیرۆکێك نابێ بە چیرۆك نووس!!




سەرچاوەکانی ئەم نووسینە:

١). سمير شيخاني - مع الخالدين - بيروت ١٩٥٩.

٢). الموسوعه العربية الميسرة، القاهرة ط٢، ١٩٧٢.

٣). موريس شربل - روسو - ترجمه: ميشال أبي فاضل، بيروت ١٩٧٨.


● کەریم مستەفا شارەزا ●

«رەنگین» سەر لەم دەزگایە ئەدات:



# بەهرەی زانستی... گەش دەبنەوە!

## خولی فراوان، بۆ پێگەیاندنی لاوان

گەلێك بەهرەی زانستی لێرەو لەوێ سەر هەڵئەدەن کە پێویستی بەردەوامیان بە دەست گرتن هەیە لە پێناو پێگە یاندنیان لەسەر بنەرەتێکی زانستی. . . بۆیەش دامەزراندنی بەرێوەبەرایەتیەکانی چاودێرکردنی زانستی هەنگاوێکی گەورەیە کە گەلێك ئەنجامی چاك ئەداتە دەستەوە.

لە بەرێوەبەرایەتی چاودێری زانستی هەولێر، هەموو ساڵێك نەخشەیەکی گونجاو بۆ ئەم مەبەستە دائەندرێ. . بۆ بەسەرکردنەوەی ئیش وکارەکانی دەزگاکە چووینە دیدەنی بەشەکانیو لە سەرەتادا بەرێز رۆستەم رسول بەرێوەبەری دەزگاکە ووتی

* دامەزراندنی ئەم دەزگایە خۆی لە خۆیدا دەست پێشخەریی‌یە بۆ لە ئامێزگرتنی بەهرە زانستیی‌یەکان کە سەر هەڵئەدەن، جاران کاتی بۆشایی لاوان بەخۆرایی دەرۆیشت، ئەم دەزگایە بەشێوەیەکی راستەو خۆ هەوڵ ئەدات پێیان بگەیەنێت. .

لە هەمووی دیارتر، رۆشنبیری زانستی لەم دەزگایەدا پێش کەش دەکرێت، هەروەکو رۆڵی









زانست و تەکنەلۆژیا بۆ پێشکەوتنی کۆمەڵ ڕوون دەکرێتەوە. . .

لە ئەنجامی خولی فراوانیش، گەلێك بەهرەی داهێنانمان دۆزیوەتەوە کە هیئەوەن بە شێوەیەکی تایبەتی پشتگیری بکرێن.

* هەروەها بەڕێز بە ڕێوەبەری دەزگاکە وتی: نەخشەیەکی ساڵانەمان هەیە کە بریتییە لە سازکردنی دەیان کۆڕو خولی تایبەتی زانستیو ڕۆژ بەڕۆژ یش خواستی لاوان و قوتابیان زیاتر دەبێت. . . لێرەشدا، مامۆستای پسپۆر هەیە کە بەگوێرەی بابەتە زانستییەکان دابەش کراون. . . بەشەکەمان، بەشداری لە هەموو چالاکییە زانستییەکاندا هەیە لە پێشانگاو پێشبڕکێو ئۆردوگاو میهرەجانی زانستی. . . بایەخی زیاتریش لەوە دایە کە کۆڕی زانستی لەم دەزگایەدا سازدەکرێن و بەشێوەیەکی بەردەوام دام ودەزگا زانستییەکان بەسەر دەکەینەوە.

زۆر لە بەهرە زانستییەکان لە بەشەکانی ئەم دەزگایە بەشداری پرۆژەی زانستی گەورەیان کردووە

* ئەی لە ڕووی لێکۆڵینەوەی زانستییەوە؟

- نەخشەیەکی تایبەتیمان هەیە بۆ سازکردنی باس و لێکۆڵینەوەی زانستی لە بواری تەکنەلۆژیاو زانست بەشێوەیەکی فراوان و گفتوگۆ کراوە لە سەر ئەو لێکۆڵینەوانە کە مامۆستا وقوتابی بەیەکەوە بەشداری ئەکەن .

* چالاکی پێشانگاتان چۆنە؟

- هەر لەوەتەی دامەزراندنی ئەم دەزگایە، بیرمان لە کردنەوەی پێشانگای هەمە جۆری زانستی کردۆتەوە، لە ئەنجامی ئەم پێشانگایانەش زۆر (بەهرە) دەرکەوتوون کە هەر یەك لە بوارێکیدا هێناندا نموونەی بەرهەمی پێش کەش کردووە. . .

* ئەی دیاترین بەشەکانتان؟

- دیارترین بەشی زانستی لەم دەزگایەدا بریتین لە کارەباو ئەلەکترۆن، زانستی ژیان، کیمیا، فیزیا، ئەستێرەناسی، جیولۆجیا میکانیك، فرۆکەوانی. . . تاد.

لە هەریەك لەم بە شانەش پسپۆری لێهاتوو هەیە، جگە لە هۆڵێك بۆ پێش کەش کردنی باس و لێکۆڵینەوەی زانستی.

* کە لە بەشەکاندا گەڕاین. بەهرەمەند

کاك عزیز سعید وتی: ئەم هاوینەو هاوینی ڕابردوو، گەلێك کەڵکمان لەم دەزگایە وەرگرت، جاران قوتابیولاوان، هیچ شوێنی ئەوتۆیان نەبوو کە تیایدا بەهرەی خۆیان بدۆزنەوە، بەڵام دروست بوونی ئەم شوێنە زانستییانە بووە بەمەڵبەندیکی پێشکەوتوو بۆ فێربوون و پێگەیاندن.



● شێرزاد عبدالرحمن ●



# هەنگاو .. هەنگاوانێكی چاكە ..

چیروكی كوردی لە كوتایی شەستەكان و سەرەتای هەفتاكان دا خوێنی تێدازاو كەوتە جم و جول و بارێكی نوێترەوە، هەولی پەل هاوێشتن بو بابەتی نوێو بەكارهێنانی تەكنیكی سەردەم و دەربرینیان بەشێوەیەك لە تاقیكردنەوەكانی سەردەمی پێشتر جیای‌كردنەوە . ئەم هەول دانانە وەكو هەموو سەرەتایەك گەلێ گرێو چوكل چوێ تێكەوت، كەف و كول و نەسازەكان دامركانەوەو هەول ‌دانە راستەقینەو رەسەنەكانیش تێكەلی كاروانی چیروكی كوردی بوون هەرچەندە بەگشتی ئەم هەولانە لە ئاستی خەمەكاندا نین و لە دوای رووداوەكانەوە لوقە دەكەن ـ بەلام هەریەكەو بەگوێرەی دەسەلات و تواناو بوچوونی خوێ لە هەول داندایە . ئەوەی دەبێ بووترێ زور ئەم دەستەیە (بەراستی) لە سەرەتای هەفتاكانەوە تێكەلی كاروانەكە بوون بەلام رێبوارانی سالانی پەنجاكان و شەستەكانیش بەگورو بینینێكی تازەوە تێ‌هەل چوونەوەو چەند زاتێكیانیش تا ئێستا نەریزی پێشەوە جێگای دیاری خوێان هەیە .

تایەر سالح سەعید هەرچەندە سالی ۱۹۷۳ (لە گەرووی مەرگەوە)ی بلاوكردەوە بەلام گەلێك لەوە پێشتر چیروكی بلاوكردوتەوە . لەوكاتەوە كە د گاتە (۱۵) سال «هەنگاوی» نووسیوە كە لەدەزگای روشنبیری‌و بلاوكردنەوەی كوردی بەچاپی گەیاندووە . ئەوەی لەبەرچاوە، چەنێتی بەرهەمی چیروكی بەگوێرەی تەمەنی نووسینی نی‌یە!! [ ئەمەیان هەموو چیروك نووسەكانمان دەگرێتەوە] بەلام گرنگ چەنێتی نی‌یە، بەلای منەوە گرنگ ئەوەیە تا چ رادەیەك توانیویە بیێتە شاهیدی سەردەمەكەی بە شێوەیەكی هونەری‌و لەبار بینینە پێشكەوتن خوازەكانی دەربری . بەرای من لە هەندێ چیروكی ئەم كومەلەدا ئەمە بە دی دەكرێ لەم روژانەدا،كە دلێ زوربەمان بەرامبەر چیروك




رەنجاوە ئەوەندە ورێنەو هەلەق و بەلەق دەخوێنینەوە زوركەم چیروكی چاك دەكەوێتە بەرچاو، یان هەندێك هەر وەك ئاگایان لە هونەری چیروكی سەردەم نەبێت بە دەوری چیروكی پەنجاكان دا دەخولێنەوە! دەلێم (هەنگاو)ی كاكە (تایەر) كەمێ ئەم رەشبینی‌یەی بو روون كردینەوە، توانیویە خەم و خەون و ئاواتی مروڤەكانی دەوروبەری بەباشی دەربرێ‌و دوای خوێندنەوەیان [ هەموویان نە] شتێكت لا بەجێ بهێلێ . (هەنگاو) نو چیروكە . . چیروكەكان هیچیان مێژووی نووسینیان دیاری نەكراوە نووسەریش لە شوێنێكی كەدا ئەمەی دەرنەخستووە . تا رەوتی بەرەو پێشەوەچوونی دەربكەوێ چیروكەكان لە نووسینیان دا گەلێ رێبازی هونەری بەكارهێناوە . هەرچەندە كەسەكانی چیروكەكان [هەندێكیان] بێ‌ناوو رووخسارن، بەلام نامو نین خەمەكانیان خەمی هەموانە هەربویەشە چیروكەكانی

زیرەكی چیروك نووس لەوەدایە بە وشەیەكێ یارستەیەك گەلێ لایەنی نهێنی ئاشكرا دەبێت یان لەكاتی دیالوگەكان دا نەك هەر سیمای هەندێكیانت بو روون دەبێتەوە بەلكو پەردە لە سەربیركردنەوەو ناوەشی بو خوێنەر ئاشكرا دەكات

كاكە تایەر كەم دەنووسێ بەلام دەزانێ چ دەنووسێ هیوای (هەنگاو)ی باشتری لێ‌دەكرێ

● احمد محمد اسماعیل ●

# لە توێشەبەرەی ژیانەوە

● نوری علی أمین ●



ماموستا جەلال تەقی ئەندازیار لە شاری سلێمانی‌یەوە، هەندێ شتی سەیری لە ڕووسی‌یەوە بۆ

## هێلکەیە.. یان گردە

کردوویـن بە کوردی‌و بۆی ناردوین، ئەوا یەکێکیان بلاودەکەینەوە:

لەم دوایی‌یەدا، لە «مەدەغەشقەر» هێـلکـەیـەك دۆزراوەتـەوە، بەرزی‌یەکەی (٥) مەترە!.. ئەو باڵندانەی ئەم هێلکانەیان کردووە لە سەدەی حەڤدەدا لە ناوچوون و نەماون.

زانـایان تەمەنی ئەم هێلکەیە بە (٧٠٠ ـ ١٠٠٠) ساڵ دادەنێن..

لە ئەنجامی تاقی‌کـردنەوە بە هۆی تیشکـەوە، ناوەکـەی قەبـارەیـەکی خڕی (١٥سم)ی تێدایـەو دەڵێن ئەمـە ڕەنـگـە زەردێـنـە وشـك هەڵاتـووەکـەی بێـت. توێکڵەکـەی چەنـد کونێکی زۆر وردی تێدایە، ئەگەر ئەم دیوو ئەو دیوی بکەی خوڵێکی قاوەیی وردی لێ‌دێتەدەرێ، کە ڕەنگە بەشێـك بێ لە زەردێنەکەی.

زانایان دەڵێن سەنگی ئەم هێلکەیە بە تازەیی (٩) کیلۆغرام بووە، کە هەشت جار لە سەنگی هێلکـەی نەعامە گەورەترە!

تۆ بڵێـیـت ئەو باڵـنـدەیـەی ئەم هێـلکـەیـەی کردووە، بەقـەدەر پاپۆڕێك بووبێ!؟.. سەیرە...

## وتەی بەجێ‌و نەستەق

● کاك علی محـمـد امـیـن لە هەولـێـرەوە، هەنـدێ قـەی نەستەق و بەجێی بۆ ناردوین، ئەوا هەندێکیان بلاودەکەینەوە:

ـ شەو بۆ حەوانـەوەو بێ‌دەنـگـی‌و کپی‌یە، کەچی چوار چین خەویان لێ‌نـاکـەوێ‌و ڕەحـەتی بەگیانی خۆیانەوە نابینن:

یەکەم: ترسنوك.

دووەم: زۆرلێ‌کراو.

سێ‌یەم: دڵدار.

چوارەم: نەخۆش.

ـ دەتوانین گشتمان بەختەوەر بین، ئەگـەر ئەژدیـهـای چاوچنـۆکی بکـوژیـن و بە چاوێکی فراوانتـر سەیری جیهان بکەین.

ـ ئەگـەر ئاگـر لەش و شـمـەك بسووتێنی، ئافرەتی خراپ ژیان و ئابرووت بەیەکەوە دەسووتێنێ.

ـ تیشکی خۆر، تیشکی مانـگ، باوبـاران، ئەمـانـە هەمـوویـان بێ‌پـارە.. بێ‌نـاوکـردن.. بێ‌باج دانـان.. سوودی خۆیان دەبەخشن بە هەزارانی جیهان..



ڕۆبۆت

● کاك سعیـد غفـور تاهیـر لە مەخمـورەوە، وتـەیـەکی دەربارەی (ڕۆبـۆت) بۆ ناردویـن، کە لە (الاسـبـوع الـعـربـي)یـەوەو، وەری‌گێڕاوەتە سەر زمانی کوردی‌و دەبێژێ:

زانـسـت لە کۆڵ نەدانـایـەو بەرەوپێـشـەوە هەنگـاو دەنێت و زانـایـانیش ڕۆژبەڕۆژ شتی سەیرو سەمەرەو بەسوود دادەهێنن.. لەم دوایـی‌دا (ڕۆبـۆت) مرۆڤـێـکی داهێنـاوە هەموو لەشی ئامێـرە..

وەکو مرۆڤی ڕاستینە دوو دەست و دوو قاچ و دوو چاو و لوت و دەمی هەیـە، بە هۆی چاوەکـانی‌یـەوە دەورو پشتی خۆی دەبینێت و بە دەستەکـانیشی زۆر شتی سەیر دەکـات، کە هەتـا ئیستا مرۆڤی ڕاستینە پێی ناکرێ.

## درۆو جۆرەکانی

● کاك عمر ابراهیم وتەیەکی بۆ ناردوین، لە وتەکەی‌دا، دەبێژێ: درۆ دەردێکی کوشندەیەو زۆر جەشنی هەیەو لەناو کۆمەڵانی خەلکی‌دا بلاوبوتەوەو دوچاری کۆمەڵێك، یان چەند کەسانێك دەبێت (خوایە.. بمان پارێزی لە درۆو درۆزن):

| | |
|---|---|
| ـ درۆی فەیلەسوف: | ڕاستە |
| ـ درۆی بازرگان: | بۆ شت فرۆشتنە. |
| ـ درۆی هاورێ: | بۆچاری تەنگ و چەڵەمەیە. |
| ـ درۆی قەرزار: | خۆ ڕزگار کردنە. |
| ـ درۆی پارێزەر: | بەرگری‌یە. |
| ـ درۆی ڕۆژنامەنووس: | زیرەکی‌یە. |
| ـ درۆی ڕامیاری: | بەرژەوەندی گشتی‌یە. |
| ـ درۆی دڵدار: | شەیدایی‌یە. |
| ـ درۆی کڕیار: | بۆ کڕینی شمەکە |
| ـ درۆی دەڵاڵ: | بۆ پارە وەرگرتنە |
| ـ درۆی ئافرەت: | بۆ خۆشەویستی ژن و مێردایەتی‌یە. |
| ـ درۆی هەستیار (شاعر): | خۆشەویستی گەل و نیشتمانە |

# منداڵێکی بێ دەست



لە سەرەتای دروست بوونی مێژووی مرۆڤایەتی‌یەوە کە مرۆڤ هەستی پەرەی سەندووە هەموو کات دەستی کردووە بە لێکۆڵینەوە بۆ چارەسەرکردنی گشت تەنگوچەڵەمەکانی ژیانی، وە هەوڵی داوە بۆ چارەسەرکردنی ئەو هۆیانەی کە دەبێتە هۆی نالەباری‌و و ژیان لە مرۆڤ تاڵ دەکات.

ئەم منداڵە ناوی «گۆران فاتح سعید بەرزنجی»یە ئێستا دانیشتووی گوندی «تازەدێ»یە سەربە قەزای «کەلار». لە رێکەوتی ٢٧/ ٧ /١٩٨٢ لە نەخۆشخانەی قەزای «کفری» لەدایك بووە، بەڵام لە کاتی خۆی دا کاربەدەستانی ئەم نەخۆشخانەیە گرنگی یەکی ئەوتۆیان بەم دیاردەیە نەداوە، ئەم هەواڵەیان رەوانەی نەخۆشخانە گەورەکانی وولات نەکردووە، بۆ لێکۆڵینەوەو تاقی‌کردنەوە لەسەر ئەم کارە زگماکی‌یە. لە هەمان کات دا کە بەشێکی لەشی مرۆڤ نامێنێ کار لە دەروون دەکات، چونکە گرنگترین نالە باری دەروونی لە منداڵ دا بریتی یەلە گیروگرفتەکانی جوڵەی لەش و هەڵس وکەوت.

لەش ساغی ئەم منداڵە زۆر باشە، لەلایەن قورسایی لەشی‌و عەقلی‌یەوە وەکو هەموو منداڵێکی ئاسایی‌یە، وە شایانی باسە یەکەم منداڵە لە خێزانە کەیان دا بەم شێوەیە لە دایك ببێ. دایکیشی خاوەنی حەوت (٧) منداڵەو دوابەدوای ئەمیش منداڵێکی تر لەدایك بووەو هیچ کەموو کوری‌یەکی نی‌یە.

بۆ خواردنی شمەك لە ماڵەوە یارمەتی دە دەن. بەڵام زۆر جار پەنا دەباتە بەر پەنجەکانی پێی، دەتوانێ بەئاسانی چا بخواتەوەو بە کەوچك شلەو برنج بخوات وە شقارتە بە پێ دا دە گیرسێنی‌و توانای هەیە شریت «بەکرە» بخاتە سەر تۆمارکەر «تەسجیل» وەکو لە وێنەکەدا دەرکەوتوە. کاتێك خۆی توانای بەسەر شتێك دا نایێ داوای یارمەتی دەکات ئەم منداڵە چەند دیاردەیەکی نائاسایی تێدا بەدی دەکرێت لەوانە:ـ

نیشانەیەك لە خواروی مەمکی راستی‌یەوەو نیشانەیەکی تر لە سەروی مەمکی چەپی‌یەوەیە. وە چاڵی‌یەکی بچووك لەجێ‌شانی راستی‌یەوەیەو پارچە گۆشتێکی خڕ لە جێگەی شانی چەپی‌یەوە دروست بووە، بەڵام ئێسقانی شانی راستی تیژە بەرەو سەرەوە کشاوە، ئەم لاو ئەو لای شانی بێ‌ئێسقانەو تەنها پارچە گۆشتە. وەکو لە وێنەکەدا دەرکەوتووە.

وەداوا لە لێکۆڵینەوەی نوشداری «البحث الطبي» دەکەین لە ئەم منداڵە بکۆڵنەوە وەکو «کەنە فتێك، تەماشای بکەن، کارێکی وا بکەن منداڵەکە دڵی پێ‌خۆش بێت، چونکە ماوەیەکە بیر لە خۆی دەکاتەوەو زۆر جار دەچێ بەناو خەیاڵ داو خەم دای دەگرێت، بۆ نموونە:ـ

جارێکیان تازە منداڵێك لەدایك دەبێت، ئەویش منداڵەکە بە رووتی دەبینێ‌و خەم دای دەگرێ‌و روو دەکاتە دایکی‌و دەپرسی:

دایە ئەوە بۆچی «بەبەکە» دەستی هەیە من دەستم نی‌یە...؟

دایکیشی توانای وەلام دانەوەی نامێنێت، هەڵ دەستێ‌و دەی باتە دەرەوە باسی شتی تری بۆ دەکات بۆ ئەوەی ئەم پرسیارەی لەبیر بچێتەوە...

لە کۆتایی دا هیوای تەمەن درێژی بۆ ئەم منداڵە بێ‌دەستە دەخوازین



● لطیف شێخ محی‌الدین ●
قەزای کەلار ـ تازەدێ



# کورتە باسێک دەربارەی بایەخ دان بە جیهانی منالان

هەروەکو خوتان لە کوتایی گوڤارەکەدا وێنەی منالێك دادەنێن و لە ژێری دا دەنووسن مندالّ زۆرکردن رەوشتێکی پەسەندە، یەزدان پیروزبایی لی دەکات. هەروەها بایە خ دان بە جیهانی منالانیش ئەرکێکی پیرۆزی سەرشانی هەموو دایك و باوکێکی دل سوزە تا دوارۆژی منالەکەی لە گەشەدابێ و دووربێ لە کاری دژوار، ئەو منالەی بایەخی پێبدرێ بە شێوەیەکی رێك وپێك ئەوا پاشەرۆژێکی روون و پرشنگدار بەسەر دەبات و دوور دەکەوێتەوە لە زۆر شتی ناهەموار، ئەوەی لێرەدا پێویستە بوترێ بە دایکان و باوکان کاتێ کە بیانەوێ منالەکانیان لە زۆر کاری ناپەسەند، دووربخەنەوە بە پێی ئارە زووە کانی ئەو منالە هەلس وکەوت بکەن، تا ئەو منالە زیاتر باوەری بە خۆی هەبێت، وە قسەیەکی تون وتیژی پی نەو ترێت کە پێی ناخۆش بێ، وە ئەو شتەی کە منالّ حەزی لێ دەکات و پێی خۆشە وەکو یاری کردن بە میکانۆی منالان و گەرێن(ئۆ تو مۆبیل)و شەمەنەفەری بچوك و بووك و مەیمون و منالی لاسیك و مۆسیقاو زورشتی تر.... هتد. وە پێویستە منالان لەم شتانە بێبەش نەبن بە پێی توانا، هەروەها گەران بۆنەو شوێنانەی کە تایبە تن بە منالەوە ببرێت تا زیاتر چاوی بکرێتە وەو زۆر بیرنەکاتەوە، لە کۆتایی دا دەڵێم چەندێ بایە خ بدرێ بە جیهانی منالان هێشتا هەر کەمە چونکە بایەخ دانی لەنەقینە بە منال ئەو منالە سەرکەتوو دەکات و لە زۆر شتی خراپ بە دوور دەکەوێتەوە.

● ن جعفر حمید ●



# گوڵە زەرد

گولەزەرد (١) (مريحه = وردمتن = ROSA FOETIDA ) دەوەنێکی قیت، یان لق بلاو و چەمەوەیە. نزیکەی (١ - ٢) مەتر بەرز دەبێتەوە رەنگی لقەکەی سوورێکی مەیلەو قاوەیی یە، درکی ئوولەیی قیتی پێوەیە، نزیکەی (١)سم درێژە هەر گەڵایەکی لە (٥ - ٩) پەلکی شیوەهێلکەیی پێت هاتووە. رەنگەکەی سەوزێکی بریسکەدارو بۆن خۆشە، گولەکەی بە زۆری تاکە پەرەی گولەکەی زەرد، یان سوورێکی مەیلەو مسی (نحاسي)یە. بەری (ثمرة) پێگەیشتووی تیدا بەدی ناکرێت لەوە دەچێت کە ئەم جورە گولەباخە، دوورەگ (هجين) بیت و لە ئەنجامی دوو جۆری تری گولەباخەوە پەیدابووبێت. بە زۆری لە بەشی خۆرهەلاتی ناوچەی دارستانی عیراق دا دەروێت (بۆ نموونە ناوچەی سلیمانی (Sulaimanyia) ، قەرەداخ Qaradagh) پینجوین (Penjwin) . ( حاجی عومەران (Haji Umran و پیرەمەگرون pira Magrun هەروەها لە سوریاو تورکیاو ئیران و بلوجستان و ئەفغانستان و ناوەراستی ئاسیاو باکوری هیندستان و ناوەراستی ئەوروپادا پێشی دەووترێت گولەباخە کێویلە Persian yellow brier, sweet brier , Wild rose هەندیك لەو بریارنامانەی (راپورتانەی) کە دەربارەی رووەکی عیراق نووسراون وای رادەگەیێنن کە ئەم جورە رووەکە لە دەوروپشتی کێلگەکان دەروێنرین وەکوو لە قەرەداخ دا پەرەی گولەکانی کۆدەکرێنەوەو بە شێوەیەکی خۆمالی دەکرێن بە خوشەك (مرەبا) rose petal jam . یان حەلوای گولەزەرد.

حەلوای گولەزەرد:-

کە گولەکە پێدەگات، قوچەکی چەرچەف لەژێر رووەکەدا رادەخەن و گولەکەی دەوەرێننەسەر (یان لە خۆیەوە دەوەرێت) ئنجا گولەکان دەهێنن و کاسە سەوزەکانیان لێ دەکەنەوەو پەرە زەردەکانیان کودەکەنەوەو بەبەرهەتاوەوە وشکیان دەکەنەوە دوای ئەوە دەیخەنە تورەکەو گوێنیەوەو دەینێرنە بازار بۆ فرۆشتن. بۆ دروستکردنی حەلواکە پەرەزەردە وشکەوەبووەکان لە ئاود دەکوڵێنن و دەیکەن بە سوزگی یەك دا (پالوینە = مصفاة) و ئاوەکەی دەرێژن.

ئنجا پەرە زەردەکان لەگەل رۆنی قرچاو و ناوکە بادەم و شیلەی شەکری خەست و گولاوە. لەسەر ئاگر. سوور دەکەنەوە بەشێنەیی تێکی هەل دەدەن. هەتا خەست دەبێتەوە، ئنجا دەیکەنە دەفرەوەو دای دەنێن هەتا سارد دەبێتەوەو پیشکەشی میوانی ئازیزی دەکەن ئەمەش یەکێکە لە حەلوا خۆمالی یەکانی ناوچەی کوردوستان.

سەرچاوە

الموسوعة النباتية العراقية

FLORA OF IRAQ

تأليف : تونسند و إيفن كيست

بمشاركة علي الراوي

من منشورات وزارة الزراعة

بغداد - الجمهورية العراقية

المجلد الثاني / ١٩٦٦

ص ١٤٣ - ١٤٤

(١) لە پینجوین (گولەزەردە)ی پێدەلێن لەك گولەزەرد.

وەرگێران و ئامادەکردنی

● کمال جلال غریب ●





مۆنالیزا زەردەخەنەیەکی بەسەر لێوەوەیە، زەردەخەنەیەکی مات و نەزانراو وماییەی پرسیار، خۆیشی هەروەها نەناسراوو تا پێنجە د ساڵ هەر جێی پرس بووە، دەبێ ئەو ژنە کێ بێت؟ هەندێک گوتوویانە ژنی فرانسیسکو کۆندۆی دۆقێکی ئیتالیایی یەو هەندێکیش گوتوویانە ژنە دۆقێکی ترەو بەم جۆرە زۆری تریش ڕەملیان بۆلێداوە.

لەم دواییەدا خاتوو لیلیان شوارتزمەزانای ئەلمانیایی کومپیوتەرزان زۆر تاقیکردنەوەی لەسەر تەختە نیگارەکانی لیوناردۆ کردووەو لەو بڕوایەدایە کە مۆنالیزا زۆر لە لیۆناردۆی خاوەنی ناودار۔تربووە، ئەم زانایە نیگاری مونالیزای لەگەڵ وێنەیەکی لیۆناردۆ خۆیدا بەراورد کردوەکە لەدوایی ژیانیدا بە تەپاشیری سوور دروستی کردووە، بۆئەم کارە لای چەپی وێنەیهونەرمەندەکەی لەگەڵ لای ڕاستی مونالیزای لە تاقیگە کانی بیل A.T.T دابەراورد کردووە لەئەنجام دا لەیەکچوونێکی زۆر وردو سەیر پەیدابووە، کە زۆر کەس لێی ڕاماون و ڕای تایبە تییان لێ وە دەستگیر کردووە.. لەم بەیەک گرتنە دا دەرکە وتووە کەکاتێک زەردە خەنەکەی مونالیزا هەڵگێڕدرێتەوە کتومت ئاوێنەیەک دەردەچێت کە زەردە خەنەی وێنەکەی لیۆناردۆی لەناودا دیارە، دەبێ ئەوەش بزانین کە لیوناردۆ ئەم نیگارەی بۆ فرۆشتن تەرخان نە کردوەو هیچ پاداشتێکی لەسەر وەرنەگرتوە، زۆر بە پەرۆشیشەوە لەگەڵ خۆی گێڕاوە لەفلۆرنسەوە بۆ میلانۆ وئەمجا رۆما پاشان فەرەنسا. بۆیە مێژوو نووسان بۆئەوە چوون کە لیوناردۆ مۆنالیزای بە لایەنێکی خۆی داناوەو وەکو گەنجینە یان سامانێک سەیری کردووە. بەڵام بیروڕای خەڵکەکە لەم ڕووەوە جیاوازە، ئەوەبوو هەندێک بەڕاستیان زانی و هەندێکیش بەپێچەوانەوە. جائەگەر خاتوو شوارتز لە تاقیکردنەوە کان و لە قسەکانی دا ڕاست بێت ئەوا ئەوەی لە مێشکی لیورنا دۆ داڤنشی دا بووە، گاڵتەیەکە کەپشتاوپشت خەڵکی هەڵ خەڵەتاندووە؟

● نازەنین علی عزیز ●

لەگۆڤاری News week ەوە وەرگێراوە

# ئاوڕێکی سەرپێیی.. لە شیعری ڕەسەن

● احمد رسول پشدەری ●

کۆرپەی هیوام...
ئەگەر ویستت شیعرێ بڵێی...
بەرگی «زیندوو»یی...بپۆشێ
بەبیستنی...
پەری ئاخی بۆ بخرۆشێ...
بەمۆسیقاو ئیستاتیکای..
دەروون کەیل... بزەبیگرێو..
شەربەتی ئارام... بنۆشێ
لێوی بەبار تەرکاتەوەو
نەرم... نەرم... هەناسەی زام
بخواتەوەو...
گرووی ئەندێشە... هەڵ لوشێ

* * *

دیدەی دنیام...
وشەی شیعر... زۆر پیرۆزە
گەردوون لەناو پێکە شیعرێ
تەلەزگەیەکی ئاڵۆزە...
چرۆی بەرەیی...
هەتا ئەوین و شەیدایش...
لقن... لە شیعر دەبنەوە...
بۆیە.. پیت و وشەو دێرو کۆپلەی
شیعری ڕەسەن...
خوای ڕازو نازو سۆزە
دیاری شۆخ.. بۆ ساڵی نوێ
چەپکێ گوڵی ڕازاوەیە
لە نێو ئینجانەی شیعرێک دا
بۆ ئەم بەهارو نەورۆزە

* * *



## ل مێڤانداريا

# تيپا ئامێديێ ياهونەرى

ئامێدیێ . . پايتەختێ ميرانيا بەهدينا . . . وارگەهێ ئاوازو هونەرو هوزان و داهينانێ . . ئامێديێ ب سروشتێ خوڤەو جوانيا سويلاڤێو چياێت خوڤە يابويە سەروكانيا ئيلهامێ بو گەلەك كەسا كو بينە ئەڤينداروسترانبێژو ئەديب و هوزانڤان و زكەڤن دا هەتا نهو شيانێت هونەرىو ئەدەبى يێ ل ئامێديێ پەيدابوين و كاروانێ هونەرىو ئەدەبى لڤێ قەزايێ هيچ وەختەكى لاواز نە بويە . .

ئەڤجا شيانێت هونەرى يێت نوى لشامێدنى نهو تيپا ئامێديێ ياهونەرىيە وداكو زێدەتر شەهرەزايێ ل چالاكىو بزاڤێت ڤێ تيپێ بزانين مە ئەڤ چاڤپێكەتنە كر دگەل هونەرمەندێ گەنج (غازى صديق ئامێدى). . .

● بو مە لسەر دامەزراندنا تيپێو كاروبارێ وێ باخڤە ؛

- لپێشيێ ئەز بناڤێ خوو بناڤێ هەمى ئەندامێت تيپا ئامێديێ بيكا بەهلێنا قەفتەكا گول و نيرگزو گول شلێراو بەبينا دكەمە ديارى ژچياێت كوردستانا رەنگين بو گوڤارا قەشەنگە وژيهاتى (رەنگين) و هيڤيا سەركەفتنىو پێشڤەچونێ بو دكەم . . ولسەر دامەزراندنا تيپێ تيامە ل سالا (١٩٨٦) ێ ياهاتيە دامەزراندن وپێكهاتيە ژ (٣٠) ئەندامىا وژ روژا دامەزراند تيپا ئامێديێ ياهونەرى وهەتا نهو مە لهەمى هەلكەفتێت نيشتيمانىو نەتەوەى ئاهەنگێت قەشەنگ يێت سازكرين لقەزا ئامێديێو ناحيا سەرسنگێو لپارێزگەها دهوكێ وزوربەى سترانێت مە دنوى نەو وهندەك ژێ ژ هوزانێت هوزانڤانێ مەزن خودێ ژێ رازى ( ڤەهيل ئامێدى)نە .

● ئايە هنگە ئاستەنگا دبينن دسازكرنا ئاهنگێت خودا؟

- براستى ئەم هيچ ئاستەنگەكێ نابينين چنكو ئەم دگەل ئێك هاريكارين و هەر ئێك ژمە دوو يان سێ ئاميرا لێدەت . .

● كاك غازى پشكداريێت تيپێ لدەرڤەى ئامێديێ چنە؟

- پشكداريێت مە گەلەكن بەلێ دێ هندەكا ژوانا بو تە بێژم. بهەلكەفتنا جەژنا نەڤروزى ل ١٩٨٧/٣/٢٢ شەهيا نەكا هونەرى يامەزن ل هەڤليرى مەلبەندێ ئوتونومى هاتە سازكرن و تيپا سليمانىو حەلەبچەو كويسنجق و تيپا هەڤليرىو رەواندزێ پشكداربون وئەم ژێ پێش پارێزگەها دهوكێ ڤە چوبوين و لديماهيا ڤێ شەهيانا بەرفرەهـ كو بەرێز سەروكێ جڤاتا ياسادانانێ لدەڤەرا ئوتونومىو بەرێز سەروكێ جڤاتا تەنفيزى و بەرێز ئەميندارێ رەوشەنبيرى ولاوان و پارێزگە رێ هەڤليرىو رازگرێ لقى هەڤليرێ پێپارتێ و جەماوەركێ مەزن ئامادەبون، تيپا مە خەلاتێ ئێكێ وەرگرت لسەر دەڤەرا ئوتونومى وهەروەسا مە پشكداريا كرى بهەلكەفتنا بوونا سەروكێ قوماندار صدام حسين ل ١٩٨٧/٤/٢٨ ێ وپشكدار يا مە يا ديماهيێ لزاخو بو بهەلكەفتنا جەژنا نەڤروزێ . .

هەروەسا من دڤێت بێژم كو تيپا مە نهو پێكهاتيە ژڤان هونەرمەندا ! .

١ - احمد طاهر حسن : لێدەرێ بزقێ
٢ - عگيد عادل: لێدەرێ عودێو ئاوازدانەر
٣ - مێهڤان احمد لێدەرێ گيتارێ
٤ - عادل صالح : لێدەرێ ئيقاعێ
٥ - ئەڤراز محمد: لێدەرێ كەمانێ
٦ - شڤان صديق : لێدەرێ بزقێ
٧ - صبحى محمد : لێدەرێ درامز جازێ
٨ - عيسى محمد : لێدەرێ آرغونێ
٩ - صبرى گوهەرزى : لێدەرێ سكسفون و سترانبێژ
١٠ - بهزاد محمد (نىوار) هوزانڤان و ئاوەزدانەر
١١ - خالد محمد طاهر: سترانبێژ . .
١٢ - سليم يونس: سترانبێژ .

ئو لديماهيا ڤێ چاڤپێكەتنێ مەچەند چاڤپێكەتنەكێت كورت دگەل هندەك ئەندامێت تيپێكرن لپێشيێ هونەرمەند (صبحى محمد يوسف) گوت مەيێ خوشە برێكا تيپا ئامێديێ ياهونەرى خزمەتا هونەرو ئاوازێت كوردى بكەين و خزمەتا كەلەپورێ مللەتێ خو بكەين . .

ولديڤرا هونەرمەند (ئەڤراز محمد) لێدەرێ كەمانێ گوت . . مەژنيڤا دلێ دڤێت خزمەتا هونەرو سترانا كوردى بكەين و مەهەمى شيانێت خو تەرخان كرينە بوڤێ چەندێو پشكداريێت مە لدەرڤەى قەزا ئامێدێ دێ پتر شيانێت مە بهێز ئێخن وئەم ناهێلين چ هەلكەفتنێت نيشتمانى بچن و ئەم چ ئاهنگا نەكەين . . .

هەروەسا هەنەرمەند (بهزاد محمد) (نىوار ئامێدى) سترانبێژە ودانەرێ ئاوازا ل تيپا ئامێديێ گوت ئەم هەول ددەين كو مڤاى زكەلەپورێ كوردى ببينين وئاوازێت كەڤن يێت باب و باپيرا نوى كەينەڤە ب شێوەكى هەڤچەرخ بو جەماوەرێ پێشكێش كەين و هندەك جارا ژێ ئەم هوزانێت هەڤچەرخ دكەينە ستران . . ولديماهيێ هەمى ئەندامێت تيپا ئامێديێ سوپاسيا گوڤارا رەنگين كرو هيڤيا سەركەفتنێ بو دكەن و سوپاس.

● احسان صديق ئامێدى ●

## خۆزگە شارەوانی هەولێر سەرێکی گەڕەکی صدام یان ئەدا

● دایــکی ڤیــان لە هەولێــر لە گەڕەکــی صدام نامــەیــەکــی بۆ ناردوین و داوا لە کاربە دەستــانی شارەوانی هەولێر نەکات، ئەگــەر ئەتــوانن و ماوەیان هەیە سەرێکی گەڕەکــەکــەیـان بدەن، بۆ ئەوەی بەچــاوی خۆیــان کارەساتی ئەو گەڕەکــە ببینن و خوا رەحمێــك بخــاتە دڵیــانەوە ،چارەســەری شەقام و کۆڵانــەکــانیان بکەن، کە شەقامی بەردەم (مەڵبە ندی لاوان) سێ ساڵە شۆستەی بۆ کراوە و ئیتر وازی لێ هێنــراوە، لە هاوین دا تەپوتۆزو لە زستان دا قوروچڵپاو، چاڵــی وای تیــا دروســت بووە شۆفێل کاری لێناکات (ئەمەیان برواناکەین!!) هەروەهالە تەنیشت ناوەنــدی زأبــن الــخــلــكــان دا) زەلکــاوێــك (بــەقــودرەتی قادر) دروست بووە، جێگایەکی باشە بۆ زاوزێی مێش ومەگەزو ئەنواعی میکرۆبات!!.

● خۆزگــا شارەوانی هەولێــر، سەردانــێــکی ئەم گەڕەکــەیــان ئەکــردو، خۆیــان بەچاوی خۆیان راستــی‌ودروستــی داوای دایکی ڤیــانیــان ئەبینی‌و وەڵامی ئیمەشیان ئەدایــەوەو، لە بوڵــەی دایکی ڤیان نەجاتیان ئەداین و خۆشیان ویژدان ئاســودە ئەبــوون و خەڵــکــیش مەمنون ئەبوو.




### زۆر سوپاس بۆ کارەبای هەولێر

■ کاتی خۆی لەم گۆڤــــارەدا و لە ژمارە (٧)ی گۆڤارەکەماندا لە ژێر ناونیشانی (بەڕێز کارەبای هەولێر بۆ کوێ بە خەڵکی ئاگرن؟) سکالای هاوڵاتی (فیصل رسول خۆشناو)مان بڵاوکردەوە، جا بەڕێوەبەرایەتی کارەبای هەولێر دڵســـۆزانە بە دەنگی رەنگینەوە هــات و بە نووسینەکەی ژمارە (٢٨٧٥) لە ١٩٨٨/٦/٢٥ ئاگــاداری کردین، کە ئێستــە لە رێگای خۆیانــەوە ئاگاداری هاوڵاتی ناوبراو بکەین، کە سەر لەو بەڕێوەبەرایەتی بە پەلە بۆ ئەوەی داواکەی بۆ جێبەجێ بکەن.

● لێــرە بە پەل زۆر ســوپاسی کارەبای هەولێر دەکەین، کە ئەوەندە بە دەنگ داوا و سکالای هاوڵاتیانەوە و خۆیەکی پاشی رەنگینیش، خوا لە تەمــووتیان زۆرتر بکات بۆ خزمەتی گەل و وڵات [illegible]

## ئەمجارە

## (ل گەڵ گوهدارا)ی

## ئیسگەی کوردیو

## پێشنیارێك

● كاك هێـرۆ اسماعیل احمـد وكـاك ئاسـۆی برای لە هەولێـرەوە

نامەیەکی بۆ ناردوین و پێشنیارێکی هەیــە بۆ بەرنــامــەی (ل گەڵ

گوهـدارا)ی ئێزگەی کوردی رادیۆ بەغـداد، کە کاك جمـال بەرواری پێشکەشی ئەکات.

لەم برایە ئەڵێ :-

+ چونکە ئەم بەرنامەیە بەتەلەفۆن تــەجیل ئەکرێ، حەق وایە پێش

لەوەی دەست بەقسـەکـردنی ئێوان کاك جمـال و (گـوهداران) بکرێ زەنگی تەلـەفۆن لێ‌بدرێ، ئینجا بوترێ(هـەلـەو)، نەك وەکو ئێستا

کە کوتوپڕ گۆرانیـەك یان مۆسیقا ئەبڕێ‌و یەکسەر (گوهدار) یاخود، کاك جمال دەست بەقسـەکردن ئەکەن!!.

● ئێمەش ئەڵێین ڕاستە حەق وایە زەنگی تەلـەفۆن لەپێش قـەکردن دا لێ بدرێ بۆ نیشانەی ئەوەی کە بەرنـامـەکـە لەتـەلـەفۆنـەوە تۆمار ئەکـرێ، جا نازانـین ئێـزگـەی کوردی ئەڵێن چی؟.




## تۆبڵێی وابێ؟.

● كاك عزیـز محـمـد آمین، لە گەرەکی هەوارەبــەرزەی سلێمـانی نامـەیـەکی بۆناردوین باسی دەردی سەری‌و گێـرمـەوکێشـەی لەگـەڵ دائیـرەی (ئـاسن و تەختـەی) سلێمانی‌دا ئەکات و ئەڵێ:-

+ دووای ئەوەی کاروبـاری مارەبـڕین و ژن هێنـانم تەواوکرد، بەگـوێـرەی بڕیـاری ئەنجـومـەنی سەرکـردایـەتی شۆڕش (عقـدی زواج)م بردو چومـە دایــەرەی ئاسن و تەختـەی سلێمـانی، کە گوایـە تەختـــە وەربــگـرم و (بـەخێـرێ)لای دارتـاش کانتۆرو بوفی و ژووری نووستن دروست بکـەم .بـەڵام دەستی دەستی‌یەکی زۆرم پێ‌کـرا وەك (نـەقڵی خانە)، (هـەفتـە داهـاتـووەوەرەوە)، دوو ڕۆژی‌تـر وەرەوە)، عقـدی زواج تاکـو ئەشعاری ئاخر وەستاوە!!)، ئەم شتـانـەم هەمـووی پێ‌وتـراو نزیکــەی دوو مانگی خایـانـد، کەچـی یەك دوو برادەری خۆمـم بینی، کاریان مەیسـەر بوو بووا!، تەختـەو داری خۆیـان وەرگـرتبو، دارتـاش ئیشی بوئـەکـردن سەرم سوڕما کەچی وتیان برا گیان لات سەیر نەبێ، بەواسطە هەموو شت جێ‌بـەجێ ئەبێ!، جارێکی‌تـر چوومـەوە سەریـان، وتیـان برۆ لە کوێ شکات ئەکەی بیکە!! منیش تەنـهـا ڕەنـگینم شك برد، نازانم چیم بو ئەکەن؟

● ئێمـە بە برایـانی لێ‌پـرسراو لەو دایــەرەیـە ئەڵێـین تۆ بڵێی وابێ هەموو شت لای‌ئێوە بەواسطەبێ؟ براگیـان، ئەگـەر داروتـەختـە تان لادەسـت ئەکـەوێ، حەق وایــە بەیەکـانی بیدەن بەو کەسانەی کە پێـویستیـان پێ‌یـەتی بەتـایـەتی (تـازەزاواکـان )، چـونکـە ئەوان نەوەی دووا ڕۆژمـان بۆ بەرهـەم ئەهێنن، پەیـرەوی هەڵمـەتی منال بوون ئەکـەن، نۆمـاڵن، دڵیـان بەدنیـا خۆشـە، ئێوەش دڵخۆشیان بکەن، خوائێوەش دڵخۆش ئەکات و لەودنیـاش جەزاتـان ئەداتـەوە ئەگــەر وەلامــی، ئەم برادەرەتر لەرێگـای ڕەنگینـەوەبدەنەوە، ئەوا ئێمە مەمنون ئەکەن

رەنگین ل دیوانا

# هونەرمەندێ دەنگ زەلال عیسی برواری

## تێکەلیا من دگەل سعیدآغاو مریم خان و محمد عارفی



## نەخوشترین تەنگاڤیا هونەری لنك عیسی برواری چی‌یە؟

گوڤارا رەنگین سەرەدانەك برە مالا بالیوزێ سترانا کوردی بو ئەوروپا یێ کوستران تومارکرین بو تەڤ ئەوروپیا ودەنگێ مللەتێ کورد گەهاندە هەمی دەڤەرا. . ئەوژی هونەرمەندێ کورد «عیسی برواری»یە وگەلەك کەیفا وی هات بدەرچونا ڤێ گوڤارا قەشەنگ و پشتی بهن دانەکێ مە داخازژێکر بو گوڤارا رەنگین لسەر ژیانا خویا هونەری باخڤیت. . .

● بو خوێندەڤانا لسەر ژیانا خو باخڤە؟

- ناڤێ من عیسی حسین «یونس» ە لسالا ١٩٣٣ ئەزلگوندێ «گاراڤا» لدەڤەرا



هونـــەرمـەنـد عیسی بروارى ل هوّلا (سینەما رولیت) ل لوبنانێ.



عیـــــى بەروارى ل هوّلا (ئارلس) ل فەرەنسا

بەروارى ژێـــرى لڤـــەرا ئامێـدیێ هاتیمە دنیایێو هەتا پوّلا شەشـێ سەرەتـــایــی یابــدیمـــاهی ئینای. ونهوّ لباژێرێ میسل دژیم..

● عیـــــى بروارى چەوا دەست هاڤێتیە ستراناو بوّچی؟

- ژ بچـیـکـیـا خو من حەژ خوشێو کەیفێ دکر ودا چمە داوەتـــاو گوهــێ خو دەمـــە سـتـــرانێت کوّچکـاو دیـوانـاو داسترانا ژبەرکەم وبوّ هەڤالا بێژم..

لســـالا ١٩٤٧ێ هونـەرمـەندێ هێزا سعید آغا هاتە مالا مە.

دوسـتـێ مامێ من بو ومقـــام دگـــوتـــن مامـــێ من گوتـــێ برازایـێ من گەلـــەك دەنـــگ خوشـــە.. ولـوێـرێ سعیـد آغـای گوتە من کا سترانەکێ بێـــژە. وپـشـتـی من گوّتی. دەســـتـــێ خو ل ملێ من داو گوتـە من دێ توّ سەرى ژمـە ستینیو بیـە شاعێـر. وگەلەك جارا ئەز دگەل سعید آغایو مریم خانێو دچـومە چایخانا «بـابـان»و وانـا ستران دگوّتن هەر شەڤێ چارێـك سەعەت وهــوســـانێ چاڤێ من ڤەبـو وڕێکـــا من ڤەبـو بوّ ستـرانـا کوردى وئەز بومە سترانبێژ...

● ئێکەمین ستران چ بو؟

- لســـالا ١٩٥٠ێ ئەز چومـە ئێزگا کوردى بستـرانا «مەدینایێ» وپشتی هنگی من لگـــەل هونـــەرمـەنـدێ مەزن محمد عارف جزراوى دوو «ڤـــاوان پـرکـــرن بوّ کومپـــەنیـــا «بشیرفوان» ل بەغدا...

● عیـــــى بروارى چەنـــد سترانێت تومارکرى هەنە؟

- لئێـزگـا کوردى دگـەهنە «٣٠٠» ستراناو لتەلڤزیونێ نێزیکی «٥٠» سترانا..

● دبیـژن هونـەرمەند عیسی بروارى دگـــەلـــەك ئاهنگــا لدەرڤـــەى عیـراقێ پشکـدار بویە ئەڤجا تو چ دبێژى؟



هونەرمەند عیسی بەروارى ل هوّلا (ویکمور) ل لندن / ١٩٧٧



- راستە ئەڤە وەیە. لسالا ١٩٧٣ ئەز و محمد عارف وگولبهار چوینە لبنانێ مەستران تومارکرینە بو تیلفزیون و ئیزگێ لبنانێ و ئاهنگەکا مەزن مە تومارکریە ل (سینمارولیت) بەهەلکەفتنا چەژنا نەڤروزا لبنانێ ولسالا ١٩٧٧ جارەکادی ئەزو گولبهار چوینە ناڤ ئینگلیزیو مەسترانێت کوردی تومارکرینەو لسالا ١٩٧٨ ئەز لگەل [ تیپا التراث یاعیراقی] بسەروکاتیا هونەرمەندێ مەزن مامۆستا [ منیر بشیر] بو ئەم چوینە فەرەنسا و نەمسا و لسالا ١٩٧٩ کومپەنیەکا سترانا ل (یونان) لدیف من هنارت و ئەز چومە (ئەثینا) ومن (٦) کاسێت پرکرینە وگەلەك شەهیانێت دی مەبیت کرین و ئەز ئێکەمین کوردم دچمە [ئێزگا مونت کارلو] ومن ستران گوتینە.. دیسان من ستران گۆتینە ل ئەلمانیاو بلغاریاو هنغاریاو رومانیا واسپانیا وترکیا.

● ئاهنگەك ژبیرا تەناچیت؟

- :- براستی ئەو ئاهنگا مە لبازێری [نیس] ل فەرەنسا کری ژبیرا من ناچیت و جەماوەری گەلەك کەیف بمن هات و ریڤەبەری [ نیس] ئەز خەلات کرم ومەدالیەکا زێری لگەل کاسەکێ دا من.

● عیسی برواری چاوا بەرێ خو دەتە سترانا کوردی؟

- براستی سترانا کوردی نوکە هەمی یازارڤەکەرە (تقلید) وهیڤی دکەین ژهەمی سترانبێژێت گەنج کو ئاوازێت بیانی پێلن ودەس پاڤێنە شینکرنا ئاوازێت کوردی ؟

● تە چ بەرهەمێت نووی هەنە؟

- من نهو چ بەرهەم نینن بەلێ لپاشەروژەکا نێزیك دێ تەفتەکا سترانا کەمە دیاری بو جەماوەری

● تەگوتی ژ سالا ١٩٥٠ من محمد عارف نیاسی وهەتا مری ئەم لگەلێك بوین ڤێجا تو محمد عارفی دانیە کیش ریزێ؟

- محمد عارف هونەرمەندەکێ مەزن بو وشیا سترانا کوردی بپارێزیت و ئەزداتیم سەرپشکا هەمی هونەرمەندا چنکی مروڤەکێ بێ ڤیربو وحەژ هونەرێ خو دکر وژسالا ١٩٥٠ وهەتا نهو چ دەنگ شتی محمد عارفی نەهاتینەو ناهێن و محمد عارف براستی قوتابخانا سترانا کوردیبو وهزار هزار سلاڤ لسەر گیانێ تەبن ئەی دەنگ خوشێ کوردستانێ؟

● تو بکیژ هونەرمەندی داخباری؟

- محمد عارف جزیری و سعیدآغای و مریم خانێ.

● چەند ئالەتێت موسیقی تولێدەی؟

- بتنێ تەمبیرێ.

● تو چاوا ڤان هونەرمەندێت خارێ دبینی؟

- تحسین طه.. هونەرمەندەك خودان پەیڤەو ناڤێ خو یێ هەی.

عبدالله زێرین.. سترانا وی من گەلەك دڤێت.

ڤیاز یوسف.. گەلەك ژێهاتی بو ودەنگ خۆشبو بەلێ مخابن

● هەڤالێت تە ژهونەرمەندا کی‌نە؟

- من چ هەڤال نینن کو شتی من لدیوانا سترانا بێژن لدیف رەنگێ من نینن؟

● چەند بچیك تەهەنە؟

- من (١١) بچیکێت هەین دوو کورو نەهـ کچ.

● نەخو شترین دەرفەت دژیانا تەدا؟

- دەمێ ئەز چویمە فەرەنسا شەهیانەکا گەلەکا زەخم بو دەمێ تیپا عەرەبی بدیماهی هاتی ئەز چومە سەر دەبێ شانۆیێ و (٦) هزار کەس لپێش من بون ئەز رینشتم دێ تەمبیرێ لێدەم من هند دیت هەمی وەتەرێت تەمبیرێ هاتنە خارێ ئەز ساربوم و خوهەکێ ئەزدام ژشەرمادا و هەر وێ گاڤێ من چێ کرەڤەو من لێدا.

● ژنڤیسەڤان و ئەدیبێت کوردی توکێ دبینی؟

- صادق بهاءالدین ئامێدی میرێ پەیڤێت کوردی بو نو ژ ژهۆزانڤانا دکتور بدرخان سندی.

رەنگین :- سێ تشت تەگەلەك دڤێن؟

- شینکاتیێ بهارێ - لاوینیوجانی - وراستی.

● سێ تشت تەگەلەك نەڤێن؟

:- مروڤێ دوورووی - درەو - سترانا تەقلید.

● پەیڤا دیماهیێ؟

- سوپاسیا گوڤارا رەنگین دکەم بوڤێ چاڤپێکەتنێ وهیڤیا سەرکەفتنێ بو دکەم وداخازا هەمی هونەرمەندا دکەم کو سترانا زراڤەکەر (تقلید) نەبێژن و سترانا نووی چێکەن وسلاڤ بوهەمیا وسوپاس.

●احسان صدیق ئامێدی●

لقی دهوك

# خۆشەویستی و هەڵس و كەوت لە ژیانی ژن و مێردایەتی‌دا



كتێبێك لە ئەمەریكا تازە چاپ كراوە ئەم كتێبە باسی پەیوەندیی نێوان ژن ومێردو باسی چۆنیەتیی خۆشەویستی‌و هەڵس وكەوت لە ژیانیان دا دەكات .

خۆشەویستی مایەی ژیانی ژن و مێردایەتی‌یەو ئەگەر خۆشەویستی نەبێت لە نێوان ژن ومێردا ئەوە دۆزەخ دەگەیەنێ، لێرەدا باسی ئەو خۆشەویستی‌یە ناكەین كە پێش ئەو پەیوەندی‌یە روو دەدات، بەڵام ئەو خۆشەویستی‌یەی كە لە یەكەم رۆژەوە ئەو پەیوەندی‌یە بەهێز دەكات؛ خۆشەویستی بەڵگەی تایبەتی خۆی هەیە ئەوەشە كەژیانی هەر ژن ومێردێك لەسەر بنەرەتێكی پتەو دابمەزرێت هەستی پاك و دەروونێكی ساف و كردەویان بەرامبەر بەیەك، لەپێش هەموو شتێك دا رێز لەیەكترگرتن پێویستەو، لەیەك كەیشتن چ ژن چ پیاو، دەبێ بە هەستێكی تەواوەوە ئەركی هەرە گەورەی ئەو خێزانە بخەنە سەرشان، ئەو ئەركەش لەسەر شانی‌یانەو نابێ خۆیانی لێ‌لادەن بەڵام شارەزاپان و زاناكانی دەروون لەم رووەوە چەند ئامۆژگاری‌یەكیان هەیە دەڵێن!! هەندێك ژن حەز دەكەن خۆشەویستی خۆیان بۆ پیاو دەربخەن ئەوەشی هەتا ساڵێك دوو ساڵ زیاتر كەمتر دەتوانێ بەجێی بهێنێ، ئافرەت كە تازە شوو دەكات ژیانی ژن ومێردایەتی بەو جۆرە تێ‌ناگات وەكو ئەو ئافرەتەی دوای چەند ساڵێك لە ژیانی ژن ومێردایەتی‌دا تێی دەگات بۆ نموونە ئافرەت حەز دەكات خزمەتی مێرد بكات ئێمەش ناڵێین پشت گوێی بخات بەڵام ئەگەر پەرداخە ئاوێك نزیك مێردەكەی بێت پێویست نی‌یە ئافرەت لە شوێنی خۆی هەڵسێت بی‌داتە دەستی یان بەپێوە بێت تا چاكەتەكەی فلچە بكات و بی‌داتە دەستی‌و لەم بابەتەو زۆر شتی‌تریش. . . .

ئافرەت كە تازە شوو دەكات لەوانەیە تاقەتێك و توانایكی هەبێت ئەم جۆرە كردەوانە بكات بەڵام لەگەڵ گەورەبوونی خێزان دا ئەو گۆڕانكاریانەی كە بەسەر ئەو خێزانەدا دێت لە هەموو رووبەكەوە ئەمە وا لە ئافرەت دەكات كە تواناو بیری بۆ ئەو جۆرە هەڵس وكەوتانە كزبێ، لەبەر ئەوە ئەو زانایانە دەڵێن ئەم جۆرە كردەوانە هۆیەكە بۆ رووخاندنی ئەو پەیوەندی‌یە لە دوا رۆژدا چونكە هەر لێرەدا مەبەستمان هەر كردەوەی ئافرەت نی‌یە بەڵام پیاویش چەند كردەویكی هەیە بەرامبەر بە ژن ئەگەر هاتوو وازی لەو كردەوانە هێنا بە تایبەتی بەرامبەر ئەو ژنانەی كە هەستێكی ناسكیان هەیەو شت زۆر گەورە دەكەن و زۆر لەشتی ورد دەكوڵنەوە بۆ نموونە ئەو پیاوەی كە ژنەكەی چی ئەمر بكات بەجێی دەهێنێت ئەگەر ژنەكەی هەر لەسەر ئەم جۆرە كردەوەیە بەردەوام بوو، پیاوكەشی نەی‌كرد ئەوا لە دوا رۆژدا جۆرە هەستی نارەزایی‌و بێزاری‌یەك بەرامبەر بەیەك دورست دەبێت بەڵام دەبێ ژن و مێرد لەوە ژیرتربن و ئەم جۆرە شتانە نابێت ببێتە كۆسپێك لەبەردەم پێوەندیان دا چونكە شت نی‌یە لە جیهان دا بەرەو گۆڕان نەروات مەرجیش نی‌یە ئەگەر ژن سەرقاڵ بوو بەرامبەر بەمێردەكەی وابزانین ئەوە بەرامبەر بەمێردەكەی گۆڕاوەو مێردەكەی پشت گوێی خستووە ئەم جۆرە شتانە ئاسایی‌یە دەبێ بەسەریان دا زاڵ بین نەوەك بەسەرمان دا زاڵ بن

● لیلی ●



# ژیان لەگەڵ ئاژەڵی دانیشتووی دارستاندا

ئەم وتارە بەشێکی زۆر کورتی توێژینەوەیێکی زانستی‌یە لەبارەی ئاژەڵی (ئۆرەنگوتان)ەوە کە یەکێکە لە توخمەکانی دیکەی مەیموون وەکو (گۆریلا)و (شیمپانزی) و، بە (دانیشتووی دارستان) ناسراوە.

خاتوو دکتۆر (گاڵدیکاسە)ی توێژەرەوە کە جێگری پرۆفیسۆری ئەنتروپۆلوجی‌یە لە دانشگای (نیومکسیکۆ لە ئەمریکا) خۆی‌و مێردەکەی لە سەر داواو پشتگیریی کۆمەڵی دانشگاو، مەڵبەندی زانستی چوون بۆ (بۆرنیۆ لە ئەندەنوسیا)و لە دارستانێکی (کالیمەنتان)دا ، بۆ ماوەی هەشت ساڵ ژیان لە ماوەی ئەو هەشت ساڵە دا خاتوو(گاڵدیکاس) دوازدە هەزار سەعاتی ڕەبەقی تەنها بە تێبینی یەوە بردە سەرو، بە ئەنجامی ئەو کارە بەرهەمێکی زانستی تێرو تەسەلی ئامادەکرد دەربارەی ئەم ئاژەڵە میوە خۆرەو دەربارەی ژیان و زاووزێ‌و گەورە بوون و خوو ڕەوشت و ڕلاەی توانای فێربوو ن و ماڵیی بوون و ڕاهاتنی لە گەڵ ئادەمیزاددا. توێژینەوەکە هەروەها برێك زانستی تازەی لە بارەی باپیرە گەورەی مرۆڤ و مەیموونەوە یەکالا کردەوە.

ئەوەی شایانی باسە ئەوەیە کەوا خاتوو ( گاڵدیکاس )هەر لەوێ یەکەمین منداڵی خۆی بوو و بەو شێوەیە کوڕەکەی پێنج ساڵی یەکەمی ژیانی دەگەڵ (ئۆرانگۆتانە) کاندا بردە سەر لە بەر ئەوەیش لەوێ‌دا منداڵی دیکە نەبوو، یاریان لە گەڵدا بکات، بۆیە بوو بە هەلێکی ڕێك و پێك بۆ دایکی تاکو تێبینی‌یەکی تەواوو ورد دەربارەی بەراوردکردنی نێوان









کورەکەی‌و ئاژەڵەکان بکات.

دکتـور (گـاڵـدیکـاس) دەڵێت کەوا خووە مرۆڤی یەکـان (واتـە: بەدوو پێ ڕویشتن، لە خواردنـا هاوبەشی کردن، قسـەکردن) بە ئاشکرایی لە کوڕەکەیدا دیار بوون بەڵام هەندێ لەم خووانە تەنها لە تەمـەنێکـی درەنـگـتردا لە (ئۆرەنگوتە) کاندا دەر ئەکەوتن و، پاش ئەوەش نەش و نمـایـان تێـدا نەدەکـرد. خاتـوو (گـالذیکاس لە سەری دەڕوات و ئەڵـێـت کەوا کورەکـەی زۆر کەرەت لاسـایی مەیمـونـەکـانی دەکردەوەو بە چوار پێ دەڕۆیشت و حەزی دەکـرد لە گەڵیـانـا بۆ نلو بنی دارستـانـەکـە بڕوات و لە بەر ئەوە ئەبـوایـە هەمیشە چاو دێریان بکردایە.

لەو هەشـت سـاڵـەدا چەنـدیـن بێچووی تەمەن یەك ساڵەی ئەگرتە خۆی و ئەرکی خواردن پێدان و، پاك کردنـەوەو ئـاگـاداری کردنی ئەخستە سەر شانی‌و تەنانەت جلی ئەکـردە بەریـان و، بە شەو لای خۆیەوە ئەی نواندن. ئەنجا تێبینی دەکـردن کەوا هەروەکـو مرۆڤ ڕژدی‌و حەسوودییان لەگەڵ یەك داو هەبـوو، هەروەهـا، توانـای حەپـەسـان، توورە بوون، ترسـانـدن خۆتێ هەڵقـورتاندن ناز ویستن و، سەر سام بوونیـان تێـدا هەبوو، ئەمانەش هەندێکی دیکەن لەتێبینی‌یەکانی دکتور (گاڵدیکاس):

١ ـ ئۆرەنگوتەکان حەز لە تەنیایی دەکەن.

٢ ـ بە یەك گەیـشتنی نێـرو مێ، هەمیشە لە سەر داوای مێینەکەیە.

٣ ـ گەر نێـرینـەیـەك ببینێ کەوا نێـرینـەیێکی دیکـەی بە هێـزتـر مێینەکەی دەوێ، شەڕی لە گەڵدا ناکات، بەجێ ی دەهێڵێت.

٤ ـ هەر هەشت نۆ ساڵ کەرەتێك ئەزێن.

٥ـ لەو زەیان دا هەیە فێری زمانی بە نیـشـانـە بـبـن و توانـای لێکدانەوەیان هەیە.

تۆژینـەوەکـەی دکتور (گاڵدیکاس) بووبـە هانـدا نێـکـی تەواو بۆ حکـوومـەتی ئەنـدەنـووسیـا تاکـو چەندەها یاسا ی‌تایبەتی دەر بکات بۆ پاراستنی ئەم ئاژەڵە کە نەك هەر









له بەر نەمانی خۆی بەڵکو له بەر پەرەپێـــەندنی چەنـدەها چەشن درەخت و بەرگرتنیان.

ئەوەی شایـانی تۆمـار کردنـه ئەوەیـه کەوا گشت وێنـەکـان له لایـەن مێـردەکـەی خاتـوو (گـاڵـدیکاسـه)وه گیراون و، خۆی پسپـۆری کۆمپیوتـەرەو، له پاش گەرانه وەیان بۆ ئەمریکا دەستێکی باڵای هەبـوه له لێـکـدانـەوەو رێك خستنی ئەو زانستی‌یانه دا که ژنەکەی کۆی کردبوونەوە.



پەراویزەکان
ناوەرۆکی وتـارەکـەو وێنـەکـانی لەم گۆڤاره

وەرگیراون:
NATIONAL GEOGRAPHIC (VOLUME 157 NO.6 - JUINE 1980) OFFICIAL JOURNAL OF THE NATIONAL GEOGRAPHIC SOCIETY - WASHINGTON D.C.( PAGES 530 - 553

**وەرگێران و ئامادە کردنی**
**● انور محمد قرەداغی ●**

# سابـاتەکەی خاڵە رەجەب



رەجەب

٥

● من کچێکی قوتابیم خۆش دەوێ، بەڵام ئێستا قوتابخانە نییە، نازانم لەکوێ ببینم؟.
هاشم عبداللە ـ هەولێر

■ ئەگەر کچ بیەوێ کور بدوێنێ
گۆزە هەڵدەگرێ لەدوور ئاودێنێ

● خاڵە رەجەب قورساییت چەندە؟
دلێر علی کرم ـ کەلار

■ قەپان نام خوێنێتەوە!!.

● راستە دەڵێن رەجەب بۆ یەکەم جار دەرزی دروست کردووە؟.
جاسم غریب، هەولێر

■ تەنها کونەکەی!

● رەجەب گیان، ئەگەر دڵداری دەریابێت و کوریش مەلەوان، ئەی کچ چییە؟.
بەختیار حمەرشید، سلێمانی

■ یائاوە، یا کەشتییە!!.

● ئەگەر رەجەب رویفی مراد دیت، دێ چ کەی؟.
شەعبان ئاری ـ موصل

■ گازیا خو د گەهینمە تە!!.

● خاڵە رەجەب، راستە دەڵێن، رەجەب بە یەك جار دوو ژنی هێناوە؟.
عمر طیب، کەرکوك

■ ئالان دیلۆنە؟!.

● دەڵێن رەجەب پیاوێکی باشە، منیش کچێکی بێوەژنم هەیە، دەمەوێ بیدەم بە رەجەب!!
مەلا یوسف غەمگین ـ هەولێر

■ لە داخ بێوەژن رام کردە بەغا
وامەلایوسف خۆی دێ بە شوێنما

● خاڵە رەجەب داوای چی گۆرانییەك لەکاك جمالی لەگەڵ گوهداران دەکەی؟:
هەورین عمر ـ کۆیە

■ بەردە، بەردە، دەبرۆ بەرۆکم بەردە!!.

● تائێستا دڵداریم نەکردووە، بیکەم باشە؟.
منیرە محمد رشید ـ سلێمانی

■ وەرە بۆلای خاڵی خۆت!!.

● خاڵە رەجەب، ئێمە دوو کیژین دەمانەوێ شووت پێبکەین، کاممان هەڵ دەبژێری؟.
سەمیرە وروژگار جباری ـ کەرکوك

■ ئەوەتان کە مووروو شینەکەی لەلابێت.

● ئایا خاڵەرەجەب بۆ سمێڵی ناتاشێ؟.
هەژار عمر ـ کەرکوك

■ چونکە ریشم دەتاشم!!

● ئەگەر رەجەب لەژور یك دا بوو، سێ و چوار کوێری لێبوو، هەموویان بووبە شەریان رەجەب چی دەکات؟
مجید رشید ـ کەلار

■ شەل و کوێرم ناپارێزم.

● خاڵە رەجەب حەزت لە خورمایە یان مێوژ؟.
عبدالخالق عثمان ـ موصل

■ خورمژ!!.

● ئایا خاڵە رەجەب شەقاوەیە؟.
ادریس مولود ـ مخمور

■ یاخییە.

● خەڵك لە وێنەکەی خاڵە رەجەبی ناو رەنگین دەترسن، چار چییە؟.
رەئوف رووخۆش ـ کەرکوك

■ لای مەلا ترس ببرن!!.

ئایا رەجەب حەز لە چ چاوێك دەکات؟:
شادی شوانی ـ کەرکوك

■ چاوی جوان!!.

کەوبازەکان

# نرخی کەوی باش لە ١٥٠٠ دینار دایە

دانیشتنی ڕەنگین لە چایخانەی کەوبازەکان







زۆرم بیستبوو دەربارەی کەو و ڕاوەکەو و کەوبازی‌و شەڕەکەو بەڵام مرۆڤ باش هەستی پێناکات تا زیاتر لێیانەوە نزیك نەبێتەوەو نازانێت کە ئەو باڵدارە ڕەنگین و جوان و دەنگە و گۆشت خۆشە عاشقی زۆرەو هەر یەکەو بە جۆرێك مامەڵەی لەگەڵ دا دەکات. هەر بۆ ئەم مەبەستە ڕووم کردە چایخانەی کەوبازەکان لە نزیك گەراجی سەعیە تەها کۆیی لە سلێمانی ئەم لێدوانەم لەگەڵ چەند کەوبازێك دا سازکرد.

● سەرەتا چوومە لای بەڕێز حاجی فتاح وەستا محمدەوە.

کاك حاجی چەند ساڵە خەریکی کەوبازیت:

- سی ساڵ زیاترەو ساتێك بێ‌کەو نەبووم بە بەشێك لە ژیانمی دەزانم.

● چ کاتێك دەچن بۆ ڕاو و بە چی ڕاو دەکەن:

- لە بەهاردا ڕاوەنێرەکەو، لە مایس دا ڕاوەماکەو، لە هاوین دا ڕاوەسەرکانی بۆ بارەکەو، لە کاتی گەرمیان و کوێستانی کەودا ڕاوە دێوجامە، ڕاویش بە تۆڕو تفەنگ و داو دەکرێت.

● ناخۆشترین کات چی‌یە لات:

- بچم بۆ ڕاو و کەوەکەم نەخوێنێت، زۆر جار کەوەکەی خۆمم کوشتووەو هاتوومەتەوە چونکە ئەگەر نەخوێنێت کەوی‌تر نایەن بۆ لای‌و ڕاوکەرەکە بە دەستی بەتاڵ دەگەڕێتەوە.

● کەوی چ شوێنێك باشە لەم ناوچەیەدا:

- ئاسناوا «پێنجوێن»، قەرەسن «قەلادزێ»، کلکەسماق، دەربەندی بازیان.

● کاك صالحی خەیات تەمەنی ٦٧ ساڵی دەبێت لە ٧ ساڵیەوە کەوبازی دەکات ئەم چەند پرسیارەمان لێکرد.

● ئەگەر بڵێین واز بهێنە دەتوانیت:

- بەخوا وازهێنان کارێکی گرانە چونکە تێکەڵی خوێنم بووە.

● کاتێ کەوەکەت دەی‌باتەوە هەستت چی‌یە!

- ئەوەندەم پێخۆشە وا دەزانم هەموو جیهان هی خۆمە.

● ئەی کە دەبەزێت:

- مات دەبم و کزکز ڕادەوەستم.

● کەوبازە بەناوبانگەکانی سلێمانی کێ بوون:

- حاجی عەلی ماستاو، حسن ئاغا، غفور کەوباز، عبد الرحمن برنجی، حمە ئاغای چەخماخسازو مەلای خەیاڵ تا ئێستاش بەردەوامەو چاویشی نابینێت زۆر شارەزایەو هەموو





# كەوەكەم ببەزێت وا دەزانم كۆستم كەوتووە
# كەوێكی باشم دەست كەوێت تراكتورەكەمی پێدەدەم

كەوێك دەناسێتەوە.

● ئینجا ڕوومان كردە وەستا بەكر محمود:

● چەند جۆر كەو هەیە!

ـ كەوی ڕەش و سپیو شینكەو هەموو كەوێكیش خاوەنەكەی ناوێكی لێدەنێت.

● نێرو مێیان چۆن جیادەكرێتەوە:

ـ بە خوێندن و بەسەیركردنی ئەت و خاڵ و لاشەیان دا جیا دەكرێنەوە.

● چەند كەوت هەیە!

ـ شەش جووت.

● ڕووداوێك لە بیرت بێت:

ـ جارێك كابرایەك ناوی عبد القادر بوو كەوەكەی بەزی ئەوەندەی گریا خەریك بوو دڵی بوەستێ.

● ئەو كەوەی شەڕەكەو دەكات بۆ ڕاویش دەشێت:

ـ گرنگە ئەوەیە ئەو كەوە سڵ نەكاتەوەو بخوێنێت لە ڕاودا، لە شەڕەكەویش دا زوو ماندوو نەبێت و بەردەوام بجەنگێت ئەوەی ئەو دوو سیفەتەی تێدابێت بۆ هەردووكیان دەشێت، ئەگینا هەر بۆ یەكێكیان دەشێت، یان بۆ ڕاو، یاخود بۆ شەڕەكەو.

● نرخیان لە چەنددایە؟

ـ بە كەو كەوتووە لەم ساڵانەدا عزیز قصاب خەڵكی هەولێرە كەوێكی لێرە كڕی بە ١٥٠٠ دینار كەوێكی تر فرۆشرا بە ١٠٠٠ دینار.

● ئەم پرسیارانەشمان ئاڕاستەی كاك عبد الرحمن محمود محمد خاوەنی چایخانەی كەوبازەكان كرد.

● لە كەیەكەوە چایخانەی كەوبازەكان دامەزراوە:

ـ هەر لە كۆنەوە چایخانەی كەوبازەكان هەبووە بۆ یەكەم جار من لە بیرم بێت سید محمد چایخانەی دانا منیش لە حەفتاكانەوە ئەم چایخانەیەم داناوە، زۆربەی هەرە زۆری میوانەكانیشم كەوبازن، یاخود








# تەنها لێفەیەکم هەبوو دام بەکەوێك

ئارەزوویان لە کەوە، خۆشم لە ساڵی ١٩٦٠وە خەریکی کەوبازیم.

● خۆشترین کاتت چییە:

- کەوەکەم بیباتەوە.

● چ کاتێ شەڕەکەو دەکرێت:

- لەکاتژمێر ٤/٥ بەیانیانی رۆژی هەینی «تەنها رۆژی هەینی دەکرێت» دەست پێدەکات کە خۆر هەڵ هات نامێنێت لەبەر گەرما، بەڵام مامەڵەو خورەکەو «بەزاندنی خوێندن» هەموو رۆژێك هەیە.

● هەو کەوێك ماڵی دەبێت.

- بەڵێ هەموو کەوێك ماڵی دەبێت بۆ هەر کوێیەکیش بروات دێتەوە، ئەو کەسەی خزمەتی بکات و نان و ئاوی بداتێ دەیناسێتەوە، زۆر کەسیش هەیە لە ماڵەوە رایان دەگرن بۆ زاوزێ.

● ئینجا چاومان بە کاك حمەی مریشك کەوت کە یەکێکە لەوانەی ماوەی ٢٠ ساڵە کەوبازە.

● لەم ئارەزووە هیچ سوودێکت وەرگرتوە:

- بەخوا زیان و مەراق زیاتر هیچی ترم دەستگیر نەبووە.

● دەڵێن ماڵ و منداڵی کەوبازەکان هەموویان لێیان بێزارن:

- کەوباز نییە لە ماڵەوە لێی رازیبن.

● ئەگەر کەوەکەت بەزی پێت ناخۆشە:

- بەخوا بەقەدەر کۆست کە وتنێك پێم ناخۆشە.

● ئاواتت چییە؟

- کەوێکی باشم دەست کەوێت هیچ کەوێك نەیبەزێنێت.

● کەو تەمەنیان دەگاتە چەند:

- کەو هەبووە تا تەمەنی گەیشتووەتە ١٨ ساڵی شەڕەکەوی پێکراوە... بەڵام هەبووە تەمەنی گەیشتووەتە ٢١ ساڵی.

● پاشان روومان کردە کاك شێخ محمدی کەوباز:

- خۆشترین کاتت چییە:

- کە کەوەکەم بەزی خێرا کڕیارم هەبێت و کەوەکەم لە کۆڵ بکاتەوە.

● شتێك کە لە یادت نەچێت:

- کاتی خۆی لێفەیەکمان هەبوو دام بە ٧ دینار بۆ کەوێك.

● هەر کەوی نێر شەڕ دەکات:

- بەڵێ بەڵام دەبێت ماکەوکەش لە ئەنیشتییەوە بێت، ئەگینا شەڕ ناکات.

● ئەگەر کەوێك بەزی چی لێدەکەن:

- ئەو کەوەی بیبەزێت ئیتر لێرە شەڕی پێناکرێتەوەو دەفرۆشرێت.

لەگەڵ ئەم کەوبازانەش دا کۆمەڵێ لاو خەریکی ئەم کارەن و بە پەروشەوەن بۆی و کەو دەکڕن و دەفرۆشن و ورددەبنەوەو بەشداری شەڕەکەو دەکەن و هاوبەشی گفتوگۆیان دەکەن، لەوانە مەریوانی نەوت فرۆش، طه شاگردی وەستا عبد الرحمن، ئاسۆ، فائق و گەلێکی تر.. چەند پرسیارێکمان لە کاك مەریوانی نەوت فرۆش کرد.

●کاك مەریوان بچیت بە لای کارەکەی خۆتەوە باشتر نییە:

- کارەکەشم دەکەم و ئەمیش دەکەم و حەزم لێیەتی‌و وازی لێناهێنم.

● کەوت هەیە:

- بەڵێ ٣ جوتم هەیەو شەڕەکەویشیان پێ دەکەم، کەوێکم هەبوو ٢٧٠ دیناریان دامێ ئەم دا کە بەزی فرۆشتمەوە بە ٤٠ دینار.

● ئاواتت چییە.

- ئەگەر یەکێ کەوێکی باشم بداتێ تراکتۆرەکەمی دەدەمێ.

**ئامادەکردنی**

**● هێرش محمد آمین ●**

# قوللەی ئیڤل



هاوینـی هەمـوو سالیـك نزیکـەی یەك ملیۆن گەڕیدە بە پەیـژەکـانـی قوللەی ئیڤـل دا سەردەکـەون، تا لەسەر بانەکەیەوە لە هەزار مەتـر لە ڕیکی دەریـا بەرزەوە سەیـری خانـووبـەرەی جوان و باخچـەی ڕەنگینی شاری پاریس بکەن، هەر کەسێ جارێ دیبێ هەرگیـز ئەم قوللەیـەی لەبیر ناچێـتـەوەو ئەمـرۆ بووەتـە دروشمیکی ناسراوی ئەم شارە

دروست کەری ئەم قوللـەیـە هونەرمەندیکی ئەندازیار بوو ناوی گۆستاف ئیڤل بوو و کە لە سالی ١٨٨٠دا دەسـتـی پیکـرد، لەو سالـەدا خاوەن کارگـەو بازرگانانی فەرەنسا داوایان لە حکومەت کرد پیشانگـایەك لە پاریس بکاتەوە، ئیڤلیش پیشنیاریکرد کە لە زارکی پیشـەوەی پیشانگـاکەدا قوللەیەکی ئاسن بە بەرزیی سیسـەد مەتـر دروست بکـریت. کاتیـك کە شارەزایان بەرامبەر بە هەلسانی ئەو قولله ئاسنە گومـانیـان دەربـڕی، ئیڤل لە وەزیری بازرگانیی گەیاند کە هینانەدیی ئەم پرۆژەیە لەتوانادا هەیـەو کاریـك نییـە لە کردن نەیـەت ئیـڤـل نەخشـەکـەی پیش کەش کرد بەلام سەیریان کرد پارەیەکی زۆر قەبەی تێدەچێت کە دەگاتە نیو ملیۆن دینار ئیڤل خۆی شانی دایەبەر بەشیکی کومپانیاکەی مەروونەکرد بۆ پەیداکردنی پارەی پیویست و یاریدەدانی حکومەتیش بە پینج یەکی پارەکە



ئیتـر پرۆژەکـە سالی ١٨٨٧ دەستی پێکراو ئیڤل بە خۆیو چل ئەنـدازیـارەوە دوو سال کاریان لە تیـك بەستنی پارچە ئاسنـەکـان دا کرد. سالـیـکـی تریش بە ٢٥٠ کریکـارەوە خەریکی چەسپانـدنی چوار تاقـەکـەی بنـەوەی بوون کە قوللەکە لەسەریان دامەزرراوە..

ڕووبـەری زەوییـەکـەی دوو فەددان و نیوە سەیر ئەوەیە لە کاتی کارکـردن دا لە هەر لایـەکـەوە سکـالای نارازی بوون و ڕەخنەو پلاری ئەم و ئەو لە ڕۆژنـامـەو گۆڤـارەکـان دا بلاودەبـووەوەو دەیان گوت ئەمە کاریکی شیتانەیەو ڕەنج بەبادانە. بەلام ئیڤل گوێی بەم قسـانـە نەداو سەرومـرو کاریکرد

لە ئاداری سالـی ١٨٨٩ قوللـەکـە تەواوبـوو، نەخشـەکیشـەکـەی لەو کاتـەدا بە دەستی خۆی ئالای فەرەنسـای لە لوتکەیەوە چەقاند لە هەر لایەکەوە ،بـۆ پیرۆزبایی تۆپ ئاگـردرا، گوتیـشـی ئالای فەرەنسـا یەکـە. ئالایەکە کە دارەکەی (٣٠٠) مەتر بەرز بێت و هەر ئەویشـە بووەتـە هۆی بەرزکـردنـەوەو چەسپـانی پەیکەری ئازادیی ئەمریکا.

ئەم زانـا بلیمـەتـە سالی ١٩٢٣ لە پاریس کۆچی دوایی کرد.

حاجی قادری کۆیی گوتویەتی:

**قوللەی ئیڤلی لە ئەفلاکە**
**عەکسی ئەو گەردشی لەژێر خاکە**

● نجلاء قادر ●



له چاوی کامێره‌که‌ی ئێمه‌وه

# بۆ چاوی کامێره‌که‌ی کاك نوری

وێنه‌گرتن له‌گه‌ڵ ئه‌وه‌ی هونه‌رێکی سه‌ربه‌خۆیه‌، هه‌موو که‌سێك پێویستی پێیه‌تی، هه‌روه‌ها به‌هۆیه‌وه یادگاره‌کان و رۆژانی خۆشی و ناخۆشیان ئه‌هێنێته‌وه به‌رچاو. شتێکی ئاسایی‌یه که هه‌ر یه‌کێك له ئێمه له ماڵه‌که‌ی‌دا (کامیرا)یه‌ك هه‌بێت، به‌ڵام هه‌ر رێگامان ده‌که‌وێته لای وێنه‌گر بۆ گرتنی وێنه‌یه‌کی تایبه‌تی.

ئه‌مجاره‌یان ده‌چینه لای وێنه‌گرێك له سلێمانی بۆ ئه‌وه ناچین وێنه‌مان بۆ بگرێت به‌ڵکو ئێمه وێنه‌ی بۆده‌گرین و به‌و هیوایه‌ین به‌وێنه‌گرتنه‌که‌مان رازی بێت و به وه‌ڵامی بۆ هه‌ندێك پرسیارمان یادگاره‌کانی ئه‌م هونه‌ر و پیشه‌یه‌ی بۆ خوێنه‌ری خۆشه‌ویست بهێنێته‌وه یاد.. بۆیه له‌دوکانه‌که‌ی [شه‌قامی کاوه، به‌رامبه‌ر قوتابخانه‌ی فه‌یسه‌ڵیه‌ی کۆن، که ئێستا بازاری، «عصری»یه] چاومان پێکه‌وت.

**سه‌ره‌تا حه‌ز ده‌که‌ین خوێنه‌رانی (ره‌نگین) بتناسن؟**

- ناوم «نوری شێخ فه‌ره‌ج» له گه‌ره‌کی گوێژه‌ی شاری سلێمانی ساڵی (١٩٣٢) له‌دایك بووم.

**+ سوپاس، ئه‌وا ئێمه‌و خوێنه‌ران تۆمان ناسی.. ئه‌ی ئێوه له‌گه‌ڵ وێنه‌گرتن دا چۆن یه‌کتریان ناسی؟**

- له‌راستی‌دا هه‌ر له منالیه‌وه حه‌زم له‌وێنه ئه‌کرد و شتێکی سه‌یر بوو له‌لام، چونکه له‌و سه‌رده‌مه‌دا وێنه‌و وێنه‌گرتن زۆر بڵاو نه‌بوو..

**+ باشه کاك نوری بۆ ئه‌وه‌ی ئه‌م حه‌زه‌ت بێته دی چیت کرد؟**

- بۆ به‌دی هێنانی ئه‌م حه‌زه‌م، هه‌روا دانه‌نیشتم به‌ڵکو که‌وتمه خۆماندووکردن به‌شوێنی‌دا چه‌ندین جار چوومه‌ته به‌غدا بۆ لای وێنه‌گره کۆنه‌کان له (باب المعظم) وه‌کو وێنه‌گر (طارق)و هه‌روه‌ها وێنه‌گری (نجوم)....

**+ ئه‌ی لێره؟**

- لێره‌ش ده‌چوومه لای وێنه‌گری خوالێخۆش بوو (یحیێ أفندی)

**+ سه‌ره‌تای ده‌ست پێکردنی وێنه‌گرتن بێگومان وه‌ك ئێستا نه‌بووه، له‌دوکانی گه‌وره‌و ئامێری هه‌مه جۆر. سه‌ره‌تا لای ئێوه چۆن بوو؟**

- وه‌ڵلا له‌پێش دا من له‌ماڵه‌وه ئیشم ده‌کرد هه‌تاوه‌کو ساڵی ١٩٥٥ توانیم دوکان بکه‌مه‌وه (که هه‌ر ئه‌م دوکانه‌ی ئێستایه)، که هه‌ستم کرد به‌ته‌واوه‌تی پیشه‌که فێربووم.

**+ یادگارێکی خۆشی سه‌ره‌تای ئه‌م پیشه‌یه‌ت؟**

- جاران کامێرای (بوکس) هه‌بوو، منیش له‌سه‌ر ئه‌و شێوه‌یه هاتم کامێرایه‌کی به‌بێ (عه‌ده‌سه)و به‌بێ (به‌کره)م دروست کرد، ته‌نها کونێکی زۆر بچووکم له‌شوێنی عه‌ده‌سه‌که تێکرد، زۆرم لاخۆش بوو چونکه وێنه‌ی خۆمانم پێ‌ده‌گرت به پارچه فلیم.

**+ ئه‌ی پاش ئه‌وه؟**

- پاش ئه‌وه‌و ساڵێك پاش کردنه‌وه‌ی دوکانه‌که (ساڵی ١٩٥٦)، پاش تاقیکردنه‌وه‌یه‌کی چاك و ماندووبوونێکی ته‌واو توانیم وێنه‌ی ره‌نگاو ره‌نگ بشۆمه‌وه له‌گه‌ڵ فلیمی سینه‌مایی و سلایدات.

ئه‌وه‌شت بیرنه‌چێت له‌هه‌مان کاتیش دا هه‌موو جۆره (کامێرا)و سینه‌مایه‌کم چاك ئه‌کرد..

**+ ئێمه ده‌زانین زۆر که‌س له‌بواری وێنه‌گرتن دا خاوه‌نی بروانامه‌ی تایبه‌تین، ئایا به‌رێزتان هیچ بروانامه یه‌کتان هه‌یه؟**

- له‌راستی‌دا تاقیکردنه‌وه‌ی رۆژانه‌ی وێنه‌گرتن هه‌ر جاره‌ی فێربوونی هونه‌رێکه، له‌گه‌ڵ ئه‌وه‌ش دا له‌ساڵی (١٩٦٥) له (قاهیره) له (مدارس الفنون الدولیة) بروانامه‌ی وێنه‌ی فۆتۆغرافیم وه‌رگرت.

**+ به‌شداری هیچ پیشانگایه‌کی وێنه‌یت کردووه؟**

- له ساڵانی رابووردودا له‌چه‌ند پیشانگایه‌کی وێنه‌ی فۆتۆغرافی به‌شداریم کردووه و چه‌ندین وێنه‌ی جوان و رازاوه‌م تیایان دا پیشان داوه له‌شاری سلێمانی...

**+ دوا وته‌ت؟**

- زۆر سوپاسی ده‌زگای رۆشنبیری‌و بڵاوکردنه‌وه‌ی کوردی ده‌که‌م بۆ ئه‌م به‌سه‌رکردنه‌وه‌یه.

**+ شایه‌نی‌نی‌یه و سوپاس**

- سوپاس.

● ئازاد ●



# ●سەرناسی ڕەنگین●



● گێلاس جلال نوری، تۆ کچێکی عاقڵ و لەسەرخۆو دڵ پاکی، زوو بروا بە خەڵکی دەکەیت، بە تەمای ژیانێکی خۆش گوزەرانی، ڕەنگە لە تاقیکردنەوەکانی ژیان دا زۆر سەرکەوتوو نەبیت، هەوڵ بدە لەو تەنهاییەی ئێستا دوور بکەویتەوە.



● نەوشاد خۆشنەوس، ئێوە هونەرمەندن، حەز لە پاشەڕۆژی ڕووناک و گەش دەکەن، دەتانەوێ بە هۆی شەخسیەت و هونەرەوە، بوونی خۆتان بسەلمێنن.



● مصطفی علی احمد، کاکەگیان، تۆ تووشی گیروگرفت بوویت، خۆت ئاڵۆز کردووە، وا دەزانی وا دەبێ، بڕوات بە بەسەرهاتەکانی ژیان هەبێ، هیوات گەورەبێ، کە لەو گیروگرفتە ڕزگارت دەبێ.



■ سەیران عبدالواحد طه، کچێکی سەلاری، دڵ ساف و بێگەردی، حەز لە تازەبابەت دەکەیت، تۆزێ تەنهاو خۆت لول داوە تێکەڵاوی خەڵك بە باشترە.



● زۆراب حسن محمود، حەزت لە خوێندنەوەو نووسینە، ئارەزووت لە هونەر هەیە، بەڵام نازانی چۆنی دەر ببڕیت؟



● حسین طه حسین، وردەکاری باشە، بەڵام وەکو تۆ نا، خۆت وا لێکردووە کە خەڵکی بە میالیت بزانن، حەز لە ڕەوشت بەرزی دەکەیت.



● عیرفان عثمان قادر، ئێوە تۆزێ مەشغوڵن، بیرتان قوڵە حەز لە لاسایی‌کردنەوە دەکەن.



● کرم زامدار اکرم، کاکی برای ئەمە کەی ئیمزایە تۆ هەتە، ئەمە لەوحەیەو ڕەسمە ئەوەندە حەزت لە کچانە، تەنانەت ئیمزاکەشت هەر وێنەیە، دنیا ئەوەندە ناهێنێ تۆزێ سادە بە، ئاگات لە خۆت بێ، یا تووشی دەردی‌سەری نەبی.



● گەلاوێژ علی عثمان، تۆ ئافرەتێکی سادەو لەسەرخۆیت، جارجار بە زۆر تورەت دەکەن، حەز لە پلەی بەرزی دەکەیت، پەلەپەل مەکە، ڕەنگە بگەیتە ئەنجام.



● صالح گەردی قەپلانی، تۆ پیاوێکی دڵ ساف و بە ڕەحمی، بەخۆرایی خۆت تووشی دوو دڵی کردووە، هەوڵی دواڕۆژی باش دەدەیت، بەڵام زەمانە باشت بۆ ناهێنێ، سەبر بکە خوا کەریمە.



● نەوزاد عثمان محمد، کاکە گیان تۆ زۆر موعەقەدی، دەرونت پڕە لە گیروگرفت و تەنگوچەڵەمە، تەنها خۆت بە ڕاست دەزانی، حەزیش لە هونەر دەکەیت.



● سلام علی، کاکە سەلام تۆ زۆر سەرکەوتوویت لە ڕەوشت و هەڵسوکەوت و ژیانی ڕۆژانەدا، پاشەڕۆژی باشت دەبێ ڕەوشتت زۆر جوانە، ئەگەر تووشی گیروگرفت هاتی، بە سەبر بە



● برزوو چالاك حسام الدین، ئێوە هیواتان بە دووا ڕۆژتان گەشە، حەز لە سەرکەوتن ئەکەن، هەوڵ بدە لە بواری ئیشی خۆت دا سەرکەوتوو ئەبی.

ئیمزا

ناو _ _ _ _ _ _ _ _ _ _ _ _ _ _ _

ناونیشان _ _ _ _ _ _ _ _ _ _ _ _ _ _ _

ڕەنگین چاوپێکەوتنێکە لەگەڵ دکتۆرە ڤیان مازەدا



# نەزۆکی مەترسی نی‌یەو چارەسەردەکرێت

ئارەزووی مرۆڤ بۆ منداڵ بوون گرنگترین و بەهێزترین ئارەزووە لە سروشت دا لە هەموو بارو زروفێك دا کە لە ژیان دا هەیە، واتای (نەزۆکی) ئەوە دەگەیەنێت کەوا چ ئافرەت و چ پیاو توانای منداڵ بوونیان نی‌یە.

لە عیراق دا لە ئەنجامی پێشکەوتنی نوژداری ئەویش بە هۆی پشتگیری‌کردنی سەرکردایەتی شۆڕش بەم لایەنەو پشتگیرکردنی دام و دەزگاکانی نوژداری، بەشێك لە نەخۆشخانەی العلویە لەبەغداد کردوتەوە کە تایبەتە بە نەزۆکی، بۆ خزمەت کردنی ئەم لایەنەش نوژدارو پسپۆری باشیان بۆ تەرخان کردووە کە چارەسەری ئەم نەخۆشی‌یە بکەن بە هەوڵ و تەقەلای ئەم پسپۆرانە زۆر حاڵەتی نەزۆکی‌یان، چارەسەرکردووە، لەبەر ئەمە سەردانێکم بۆ نەخۆشخانەی (کرامە)ی تعلیمی لە بەغداد کرد، لەوێ لە بەشی ژنان و منداڵ بوون چاوم بە دوکتۆرە ڤیان کەوت کە دوکتۆرەیکی کوردەو سەرۆکی بەشەکەیە دکتورە ڤیان یەك پارچە چست و چالاکی‌یە ئێمەش دەڵێین ئەمەیە نموونەی نوژداری وڵاتەکەمان کەوا بە بێ وەڕس بوون و بێزاری خزمەتی هاووڵاتیان دەکەن و بە ئەرکێکی گەورەی سەرشانیان دائەنێن..

پرسیارێکم لێ‌کرد دەربارەی نەزۆکی هۆی، ئەم نەخۆشی یەو مەترسی چی‌یە؟و جۆرەکانی‌و چۆن چارەسەردەکرێن؟ لە وەڵام دا ووتی:

پێویستە بیر لە نەزۆکی نەکەینەوە مەگەر پاش دوو ساڵ بە سەر شووکردن کە ئافرەت لەم دوو ساڵە سکی‌نەبوو ئەمەش نەزۆکی سەرەتایی پێ‌دەڵێین، ئافرەتەکە هیچ هۆیەکی نی‌یە بۆ سك پڕی منداڵ بوون لە ٦٠٪ی ئافرەتان سکیان دەبێ لە ٦ مانگی یەکەمی شووکردنیانەوە و لە ٨٠٪ و ٩٠٪ یان لە ساڵ ونیوی یەکەمی سکیان دەبێ سەرەڕای جۆرێکی تر هەیە لە نەزۆکی ئەوەیە کەوا ژنەکە سکی نابێ ئەمەش نەزۆکی سانەوی پێ‌دەڵێن ئەمەش دەبێتە هۆی نیگەرانی‌و دڵەراوکێی ژن و مێردەکە هەندێ کەسیان تووشی نەخۆشی سایکۆلۆژی دەبن لە ئەنجامی بیرکردنەوە لەم مەسەلەیە تەنانەتپیاویش.

هەروەها چەند هۆیەك هەیە بۆ نەزۆکی بە پێی ناوچەو کۆمەڵگاو باروزوروف دەگۆڕێت و چەند هۆیەکی ترهەیە کە زۆرە ئافرەت و پیاو لە لایان کۆدەبێتەوە بە وردی باسی‌لێوە دەکەین:-

١ - گیرانی لولەکانی منداڵ دانی ئەو ئافرەتە لە ئەنجامی نەخۆشی (سیلان - سیل)، هەوکردنی پاش منداڵ بوون و لە بارچوون ئافرەت لەو کۆمە ڵگایانەی پلەی کۆمەڵایەتی‌و ئابووری‌یان نزمەو هەژارن، زیاتر لولەکانیان دەگیرێت ئەویش لەبەر کەم وشیاری تەندروستی.

٢ - هۆی تەمەن: ئافرەت پێزی (خصوبە) لە نێوان (٢٠ - ٣٠) ساڵ دەبێت هەندێ کۆمەڵگا زیاتر حەزدەکەن ئافرەت تا هەرزەکارە شوبکات، هەندێ کۆمەڵگاش کە بە تەمەن دەڕوات واتە لە تەمەنی ٣٥ - ٤٠ ساڵی..

٣ - هۆی بە یەکگەیشتنی پیاو وژن ئەم هۆیە زیاتر کار دەکاتە سەر منداڵ بوون و هەرچی زیاتر ئەو ژن و مێردە لە ماوەی ناوەڕاستی بێنوێژی ئافرەتەکە بەیەك گەیشتن ڕێژەی سك پڕی زیاتر دەبێت.

● پرسیارێکی ترم لە دوکتۆرە ڤیان کرد دەربارەی هۆی نەزۆکی مێردەکەو چۆنیەتی چارەسەرکردنی..؟

لە وەڵام دا ووتی:

ئەم حاڵەتە بەم جۆرەی خوارەوە ڕوون دەکرێتەوە:-

١ - لەوانەیە هەر بە منداڵی‌یەوە تووشی ملەخری‌و هەوکردنی (فتق) بووە، ئەمە هۆیەکە لە هۆیەکانی نەزۆکی هەروەها جگەرەکێشان و خواردنەوە،

توشی هەوکردن و لاوازی جنسی دەکات...

٢ - دەبێت مێردەکە لە عیادە خۆی فەحس بکات ئەم فەحس کردنە یارمەتیمان دەدات هۆی تری نەزۆکیمان پیشان بدات بۆ نموونە پیاو لە پیاوەتی دەکەوێت یاخود تێکچوونی کاری (الغدد الصماء) یاخود بوونی دەوالی لە زەکەریدا هتد ...

٣ - شلاوی منوی فەحس بکات ئەمەش لە گرنگترین ئەو فەحسانەیە کە دەکرێت بۆ پیاو بۆ ئەوەی بزانرێ پیاوەکە تووشی نەزۆکی بووە یا نە چونکە ئەم فەحسە ژمارەی گەراکان و (حیامن) جوڵانەوەیان، ژمارەی ئەو گەرا سروشتییانەی کەوا زۆر گرنگن، روون دەکاتەوە، لەبەر ئەوەی کار دەکەنە سەر سك پڕی ئافرەتەکە.

٤ - هەروەها چەشنە فەحسێکیتر هەیە کە لە تاقیگا دەکرێت کەوا دیسانەوە یارمەتیمان دەدات بزانین هۆی نەزۆکی چییە وەکو فەحس کردنی هورمونەکان کە پەیوەندی بە لووەی کظرای‌و لووەی دەرەقییەوە هەیە.

● **پرسیارێکیتر: چارەسەرکردنی نەزۆکی لای مێردەکە چۆن ئەکرێت؟**
وەڵام بە:

١ - ئامۆژگاری مێردەکە دەکەین بۆ چاککردنی شلاوی منوی، دەبێت جگەرەکێشان و خواردنەوە کەم بکاتەوە هەروەها قەڵەوی بۆ باش نییە تا دەتوانێت لە قورسایی پشێ کەم بکاتەوە و وەرزش بکات و خۆی لە خەفەت و نیگەرانی دووربخاتەوە چونکە حالەتی سایکۆلۆژی‌و دەروونی زۆر کار دەکاتە سەر نەزۆکی...

٢ - چارەسەرکردنی نەشتەرگەری، چارەسەرکردنی دەوالی، کردنەوەی لولەکان کەوا گەراکان دەگوێزنەوە.. ڕێژەی سەرخستنی ئەم جۆرە عەمەلیاتانەش زۆر کەمە.

٣ - چارەسەرکردنی هۆرمۆنەکان دەکەوێتە ئەستۆی نۆژداری پسپۆر هەروەها دەبێت پیاوەکە پێبووترێت ئەگەر توانای منداڵ بوونی هەبێ یا نەء ..

پرسیار:
بێینەوە سەر هۆی نەزۆکی لای ئافرەت و چۆن چارەسەردەکرێت. ؟
لەوەڵام دا دکتۆرە ڤیان ووتی:

١ - لەوانەیە ئافرەتەکە پێش شووکردنی تووشی سیل و سیلان بووبێت ئەمەش دەبێتە هۆی نەزۆکی ..

٢ - فەحس کردنی ئافرەتەکە لەوانەیە ڕێگەیەکمان پیشان بدات کەوا هۆی نەزۆکی چییە وەکو هەوکردنی ملی منداڵ دان وهەندێ هۆیتر.

٣ - هەندێ ئافرەت هەن منداڵ دانیان نییە یاخود بوونی ئاوسان و پەنامی لیفەگەری .. فەحسی سەریری‌و شعاعی‌و شیکردنەوەی (تحلیل)ی تاقیگا بۆ دەوروبەری منداڵ دان، یارمەتیمان دەدات نەخۆشییەکە رەچاو بکەین و بزانین هۆی نەزۆکییەکی چییە..

٤ - لە هۆیەکانی نەزۆکی پەیوەندی بە لولەکانی منداڵ دانەوە هەیە هەروەکو باسمان کرد یەکێکە لە هۆیە سەرەکییەکانی نەزۆکی لە ئەنجامی هەوکردن و سووربوونەوە لەبەر ئەمە پێویستە فەحسی جوڵانەوەی لولەکانی منداڵ دان بکرێت ئەمەش بە ئەشعەو ناظور دەبێت ئەگەر گیرابێت ئەوە پێویستی بە عەمەلیاتی نەشتەرگەری هەیە.

٥ - تێکچوونی کاری هەردوو هێلکەدانی منداڵ دان ئەمەش ڕێژەی لە نێوان ١٠ - ١٥٪ ی ئەو ئافرەتانەیە کە تووشی نەزۆکی دەبن، مەبەستمان لە تێکچوون واتە لاوازی هەردووهێلکە دانەکە (مبيض) ئیتر توانای منداڵ بوونی نییە.

لەم حالەتەدا پەردەی چلمی منداڵ دان و بەرگی منداڵ دان، هارمۆنەکانی لوەی کظری فەحس بکرێت چونکە یارمەتی هێلکەکانی منداڵدان دەدات بۆ منداڵ بوون، هەروەها بە کۆئەندامی سۆناریش فەحس دەکرێت.

بۆ چارەسەرکردنی تێکچوونی هێلکەدانی منداڵ دان بەم جۆرەی خوارەوە دەبێت:-

١- بە هۆی دەرمان ٢ - بە هۆی نەشتەرگەرییەوە ، کە بۆ هەردوو هێلکەدانەکە بکرێت ئەمەش لە یەك حالەت دا دەبێ کاتێك هێلکەدانەکە کیسەی ئاوی تێدا دەبێت.

بەڵام جاری وا هەیە نەزۆکی ژن و مێردەکە دەبنە هۆی منداڵ نەبوون واتە هەردووکیان نەزۆکن.

هەروەها چەند حالەتێکی تر هەیە بۆ نەزۆکی کەوا ڕێژەی لە نێوان ٥ - ١٠٪ی ئەو ژن و مێردانەن کەوا تەندروستییان زۆر باشەو هیچ هۆیەك لە لایان بەدی ناکرێت بۆ منداڵ نەبوون. پێویستە ئەوەیان تێبگەیەنرێت کەوا ئومێد نەبڕن، ئەوەی ئومێدی هەبێ هەموو شتێکی بۆ دێتە دی.



ڕیپۆرتاژ و وێنەگرتن
سمیرة محمد علي




# ئێمەو دەست و خامە ڕەنگینەکان

● سکرتێری نووسین ●

جاران لەسەردەمی گۆڤاری گەلاوێژدا (١٩٣٩ - ١٩٤٩) هەرکە گەلاوێژ ساڵێك دەچووە سەرتەمەنی، پیرەمێردی نەمر بە پارچە شیعرێك پیرۆزبایی لێ دەکردو بڵاودەکرایەوە، وەك (گەلاوێژ ساڵی شەشە × دڵ روون کەرەومو گەشە × خوایە نەیبری ئەم بەشە) (گەلاوێژ حەوت ساڵانە × چرای شای عەودالانە × تاڵانە هەی تاڵانە)

ئێستا گۆڤاری (ڕەنگین)تان ڕۆژ نییە بە هۆنراوەو پەخشان بە قسەی شیرین و جوان پیرۆزبایی لێ نەکرێت، ئێمە چی بکەین، ئەگەر هەمووی بەجارێ بڵاوبکەینەوە دەبێ سێ مانگە جارێ ژمارەیەکی تایبەتی بۆ ئەم مەبەستە دەربکەین، ئەگەر بڵاویان نەکەینەوە ئەوا دڵی جەماوەری ڕەنگینمان لێ دەتۆرێت، پارچە هۆنراوەی ئەوتۆشمان بۆ هاتوە یەك دوو لاپەڕە شیرەئەمما شیعر، ڕێرەوی گۆڤارەکەشمان ئەوەندە لەگەڵ شیعردا نییە، ئێمە لەمەولا ژمارەیەك وەڵامی پرسیارەکانتان لەم گۆشەیەدا دەدەینەوە ژمارەیەکیش ڕەخنەو تێبینیو پێشنیازەکانتان دەخەینە ڕوو ژمارەیەکیشیان هەندێك لە پیرۆزبایییەکانتان بڵاودەکەینەوە کەپیرۆزبایی ئەم جارەمان هەڵبژاردەیەکە لەو شیعرە پیرۆزبایی‌کردنانە، پەخشانمان خستوەتە ژمارەیەکی‌ترەوە، وابەم جۆرەش پێشکەشی ئێوەی بەڕێزی دەکەین.

- ژبازێری (میل) بەڕێز خاتوون (دایکا ڕێفینگە):

ڕەنگین گەها جیهانێ
گەشە وەکە ریحانێ
ئەڤرۆ هاتە دیلانێ
مینا بویکا خەملی
ڕەنگین بێهنا تە خوشە
وارێ جوان بە دوشە
بکە ریبا وەك بوشە
بەردە خارێ ناڤ دلی
ڕەنگین بەندا سەربەستی
ئەخشەك جانە تە ڕستی
بیرباوەڕو هەستی
بارێ تەکەت سەرملی
تۆبو وارو وڵاتی
وەکە ڕۆژێ هەڵاتی
ڕەنگین کچا ژیهاتی
تویا جان و چاف کلی

له (تەق تەق)ەوە (مصطفی محمد نجم) دەڵێ:

هۆ ڕەنگینە ڕەنگینەکە هۆ نەشمیلە چاو شینەکە
تۆ زۆر ڕەنگین و جوانی تۆ ڕەنگین و ڕەنگاو ڕەنگی

هاوڕێی (کاروان) و (بەیانی)

له (سلێمانی)یەوە (جەزانوری حەمەطالب ماملێ) نوسیوێتی دەڵێ:

ڕەنگین گوڵێکە گەشاوەو جوانە
گۆڤارێکیشە لە کوردستانە
شاگوڵی دەستی پیرو لاوانە ·
کارتە پیرۆزەی دەستەی عاشقانە
گۆڤاری (ڕەنگین) هەر خۆی ڕەنگینە
وتەی شیرین و بەرگی ڕەنگینە

له (هەولێر)ەوە (کەیفی کوردستانی)دەڵێ:

گۆڤاری ڕەنگین تۆ دڵ خۆش کەری
بۆ خەمی دڵان هەر تۆ لابەری

گۆڤاری جوانی دەزگای ڕۆشنبیر
بە تۆ دڵشادن جوان و لاو و پیر
ڕێزت زۆرهەیە لەلای خوێنەوار
تۆیان خۆش ئەوێ خەڵکی لادێو شار

- له (پردێ)وە (نازم بیزار) دەڵێ:

گۆڤاری ڕەنگین گۆڤاری ڕەنگین:
ئەی گوڵی جوانی ڕازاوەو ڕەنگین
تۆ خەم لابەری لە دڵەی غەمگین:
لای من خۆشەویست تری لە دوزگین

(دوزگین) ناوی خۆشەویستەکەی شاعیرە.

- له (چەمچەماڵ)ەوە (اسماعیل حمه رشید)دەڵێ:

هەوڵ و هەڵمەتی خۆش و بەتینە
بەرهەمی خۆشە هەرخۆی ڕەنگینە
ناوی ڕەنگینمان وا لەسەر زارە
لەلای خوێنەران خۆشییەکی دیارە
خونچەی نەمامی گۆڤاری (ڕەنگین)
پاراوی جوانی خستە سەرزەمین

- له قەزای (دوکان)ەوە (کمال شوکت حمه خورشید) دەڵێ:

پیرۆزبێ جەژنی قوربان
لەگەڵ سلاوی گەرمی هاوڕێتان
ئەیهۆنمەوە بە وشەی سەنگین
ئەیکەمە دیاری گۆڤاری (ڕەنگین)

- له (هەولێر)ەوە (صالح محمد کلێشەیی) دەڵێ:

گزنگی ڕەنگین دەرچوو لەدەم کەل
چاوی تینوومان پێی گەشایەوە
خوێنەر بۆی ڕەخسا لە بارترین هەل
دوگمەی هیوامان پێی کرایەوە

- له (کەرکوك)ەوە (نەوزاد آمین) دەڵێ:

سلاو ناسکتر لەرەیحانەو گوڵ
وەك دەنگی بولبول لەسەر لقیچڵ
سلاو ناسکتر لە گوڵی جوان
وەك شەنگەبیری لەسەر ڕێگا شوان
ڕەنگین لابەری گشت تاڵی ژینە
ڕەنگین دەرمانی دڵی غەمگینە
کاتێ بەسێ خۆت بی لەگەڵ ڕەنگینا
خۆتی سەرداری ئەم سەرزەمینە

ـ له پارێـزگـای (دهـۆك)هوه (هیڤی أمین ئهتریش )
دبێژێت :
لاڤژا مه دهنگێ تهیه   ڕهنگین
گولاگهش رهنگێ تهیه   ڕهنگین
کراسی بویکا سالێ   ڕهنگین
ژ جل و بهرگی تهیه   ڕهنگین
* * *
گهش گولی تو ل باغا   ڕهنگین
بێن خۆش له ههمی چاخا   ڕهنگین
کهسك و سور زهرو ئالێ   ڕهنگین
چنارا ل بهر ئاڤا   ڕهنگین

ـ له سلێمـانییـهوه(حیـدر حمه فرج) ی دانیشتوی گهڕهکی خهبات ژماره خانوو ٣٣٢/٣/٥ ئهڵێ:

ڕهنگین ئهی ڕهنگین   ئهی زانست بهخشین
ڕهنگینه زۆر دڵگیره   ڕهنگینهو ڕۆشنبیره
ڕهنگینه هۆش و ههستم   ڕهنگینه گشت مهبهستم

ـ له (سهنگهسهر)هوه (خالد عزیز کریم) دهڵێ:
بای شهماڵ خهبهری هێنا   بهلهنجهو لار خۆی ههڵێنا
جاری دا لهشارو لادێ   وازستان ڕۆیی بههار دێ

جانهگهر لهدڵتایه خهم   دای گرتووی پهژارهو ماتهم
ڕهنگین بخوێنهوه کاکه   ئهی چهند خهمرهوێنێ چاکه

ـ له (سلێمانی)یهوه (أنور مهنمی) دهڵێ:

پێش گهڕانهوهی بههاری ئهمساڵ
ڕهنگین پێی بهخشین نێرگزی چاوکاڵ

بههارمان ئهمساڵ ڕازاوه دهبێ
چونکه گوڵ ڕهنگین شاگوڵیان دهبێ

ڕهنگین بهجارێ ڕهنگت دایهوه
دڵی خوێنهرت پێ گهشایهوه

ـ له (قهڵادزێ)وه (خهنده کریم فرج ) دهڵێ:
دیم ئینجانهیهك له کتێبخانه
گوڵێکی گرتوه زۆر گهش و جوانه
پرسیم ئهو گوڵه وا لهبهرچاوه
ناوهکهی چی یه؟.. ڕهنگینی ناوه

که خوێندمهوه ئنجا بۆم دهرکهوت
ناوهڕۆکهکهی وهکو مانگه پشکۆت

ڕهنگین ڕهنگینه بهگوڵی **ڕهنگین**
ههروهکو باخچێك گوڵی **زهردو شین**

ڕازاوهتهوه **به شیعرو پهخشان**
به وتهی خۆش **و به دیمهنی جوان**

دوعام ئهوهیه ههر بهردهوام بێ
وهك خۆشهویستێك دائم له لام بێ

ـ له (ئهینهوا)وه (مصطفی علی )دهڵێ:

ڕهنگین ڕهنگینه وشهی پاك و جوان
لهبۆ خزمهتی گشت بههرهوهران

پێش برکێیهتی له خزمهت کردن
تاکه گۆڤاره له ههڵمهت بردن
هیوامان وایه ههر بهتهمهن **بێ**
گۆڤاری ڕهنگین له سهرکهوتن بێ

ـ له (کۆیه)وه (ابراهیم **قادر ابراهیم) دهڵێ:**

ڕۆژ باش ئاراستهت پێشهکی **ڕهنگین**
ههر بهردهوام بی به **سۆزربهتین**

تۆ بویته بهرههم له باخی ژیانم
جێگهی خۆت گرتسوه لهدڵ و گیانم

ـ له (ههولێر)هوه(جمال ماستاوهیی)دهڵی:

ڕهنگین واهاتی تۆ بهسهر چاوان
خۆش حاڵیت خسته ناودڵی لاوان
یاخوا بهخێر بێی ڕهنگین ڕهنگین
یهکهم گۆڤاری له سهر ڕوی **زهمین**

**ـ له (تهق تهق) هوه (ئارام صابر حهوێزی) دهڵێ:**
**پیرۆزبێ گۆڤاری ڕهنگین:   شادی خسته دڵی خهمگین**
**ئاشتی خوازه جوانی بهڕهنگین:   مۆمێکه تازه ههڵ گیرسا لهژین**
**ههرکهس بخوێنێ گۆڤاری ڕهنگین:   دڵی تازه دهبێ له ژین**

**ـ له (دهربهندیخان)هوه (دیار)دهڵێ:**
**گوڵانی بههار بهگشت ڕهنگێوه**
**ڕهنگێ پێك دێنن وهك ئاڵی لێوه**
**نهخشانی (ڕهنگین) لهگشت ڕوهوه**
**وهك خۆراکی ژیان هاته کایهوه**
(ڕهنگین) کام ڕهنگین بهحهوت **ڕهنگهو-**
پاراوی ئهکات ئهو کهژو کێوه
ئنجا ڕهنگینه گۆڤاری (ڕهنگین)
شیلاوی ئهتکێ وهك شانهی **ههنگوین**

**ـ له (سلێمـانی) لهگـهڕهکی (تـووی مهلیـك)هوه (مهریوان مجید شارباژێری) دهڵێ:**
**دیسان گوڵێکی تازه ناوی کهوته سهرزار:**
**له ئاخر مانگی نۆسهو ههشتاو حهوت لهگهڵ ههزار**
**ئهکا خزمهتی کوردمان گفتوگۆی شیرینه:**
**وتهی بهسودیو جوانه دهڵێن ناوی ڕهنگینه**

**سوپاس بۆو برایانه هیلاك بوون له ڕهنگین:**
**هیواداریمزۆرترین هۆی پشکهوتنی ژینه**

ـ **زۆر سوپاس** بۆ ئێوهی بهڕێز جهماوهری **ڕهنگین دڵنیـــابن** تائێمـــه مابین له خزمـــهتی وشـــهی پاکی **کوردیدا** دهبین ، ڕێـز لێنـانی ئێوه خوێنی ساردی تهمـــهنی پیـرێتیمـان گهش دهکـاتـهوه ، سوپـاس، سوپاس







# ئافرەت و... چەند ئامۆژگاری یەك بۆ جوانی نواندن



خوشکی ئازیز:-

● پێش ئەوەی دەرمانی ئارایشت بکرێت و پێش ئەوەی ماکیاژ بکەیت، پێویستە ئاورێك لە جۆری دەم و چاوت بدەیت، ئایا چوار گۆشەیە یا خرە یا لاوازە یا پرە، پێستت چەورە یان وشکە؟...

نەرمە یا زبیگەی تیدایە؟ چونکە ئارایشت کردن ناشیرینیو نارێکی دەم و چاو دەشارێتەوە بە شێوەیەکی جوان و رێك و پێکی دەر دەکەوێت... با رەنگیکراس پێویستە لەگەڵ رەنگی ماکیاژەکەت بگونجێت، چونکەئارایشتی بەیانیان بۆ دائیرە جیاوازە لەگەڵ ئارایشتی ئێواران دا. لێرەدا دەشێت چەند ئامۆژگارییەکی یارمەتی لە شارەزاو لێکۆڵەریهونەری جوان گەری وەربگریت بۆ ئاڵوگۆر کردنی رەنگی ئارایشتەکەو چۆنیەتی گونجاندنی لەگەڵ جل و بەرگ و بۆنەکانی دەرچوونت.

خوشکی هێژا

● ئارایشتی بووکێنیت پێویستە وەها بێت کە دەم و چاوت لەلایەن رەنگە و جۆری بگۆڕیت کە لەگەڵ ئەو بۆنە ئازیزە بگونجێت کە دەم و چاوت لە گەڵ هەموو رەنگەکانی گوڵ و گوڵزارە کە لە دەورو پشتیایە یەك بگرن بۆ ئەوەی ئەو جوانییە بدا لە رەنگی چاو، لێوەکانت بە شێوەیەکی تایبەتی.

● شارەزایانی ئارایشت هەمیشە ئامۆژگاریت دەکەن کە هیچ هەوڵی ئەوە مەدە لاسایی کەسایەتییە ناوبانگەکان بکەیت لە کاتی بەکارهێنانی ئارایشت، بۆ نموونە نەك بڵێت وەکو ئارایشتی جوان کولنیز یا دیانا سبنسر یا سارە، بەڵام پێویستە ئارایشتت سەربەخۆبێت دوور لە لاسایی کردنەوە.

هەروەها پێویستە لە کاتی ئارایشت کردندا... زۆر بایەخ بدرێتە ئارایشتی لووت، چونکە لووت بەشێکی هەرە گرنگە لە دەموچاو و بەهۆی ماکیاژەوە نارێکی دەشارڕێتەوە بۆ نموونە ئەگەر لووتت گەورە بوو ئەوکاتە هەندێك سووری رووومەت لێی دەدرێت و لەئەنجاما پانی لووت دەشاریتەوە.

لەکۆتاییدا هیوادارم خوشکی ئازیز ئەم ئامۆژگارییە کەم وکورتە سوودی لێ وەربگرێت. لەگەڵ سوپاس دا.

● زینب حسین ●



# هەفتەنامە

مامەقالە

● عبدالقادر بابان ●

## هەفتە نامەی سێیەم

### شیری نیدۆ

ئای ئافرەتی ئەمرۆ چۆن پیاوتان شەرمەزاری دووکاندار کردووە بەخوا باوکم ؛ بەرەحمەت بێ لەگەڵ مردووی ئێوەدا ئەی فەرموو جاران منداڵێ گەرەکێك بە شیری مەمکی ئافرەتێك پەروەردە دەبوو، نازانم ئافرەتی ئەمرۆ بۆ شیر نادەن بە منداڵ، قاچم سوا ئەوەندە گەرام و سوێندی درۆم بیست، ئۆخەی ئەمە دوکانی ئەو حاجی یە یەکە پێیان وتم.

مامەقالە:ـ حاجی خوا بازارت بدات

حاجی:ـ ئای بەخێربێیت برای شیرینم ئەمرکە!!

مامەقالە:ـ مامە حاجی زاڵم ئەمر نەکات تو ئەو مەکەیەی زیارە تت کردوە یەك قوتو شیری نیدۆم بەرێ بۆ منداڵەکەم خوا لێت رازی بێ

حاجی: کاکە وەڵاهی وەبیلاهی وەتەلاهی کە هەرسێکی ناوی خوایە نەهاتوە بە دوکانم داو وەرم نەگرتوە!!

مامەقالە:ـ حاجی سوێند مەخۆ بروا دەکەم بەڵام حاجی ئاشنات حاجی عزیزی مەلا غفور ناردوومی بۆ لای بەرێزت دەزانم بەرێزتان بەگران کریوتانە منیش بەنرخەکەی خۆی نامەوێ چەند دەفەرمووی دەیخەمە سەرچاوم بۆ منداڵم دەوێ زۆر زۆر مەمنوونم،

حاجی:ـ تۆ دانیشە برام بە پێوە مامەلە ناکرێ

مامەقالە:ـ حاجی گیان دڵم خۆشکە هەیە، یان نا

حاجی :ـ تۆ دانیشە با چایەکت بۆ بانگ کەم مادام لای حاجی عزیزەوە هاتوی.

مامەقالە:ـ خوا نەیبرێ، حاجی گیان بای چەندە با پارەکەت بدەمێو بڕۆم..

حاجی: برای شیرینم خوا ئاگای لێیە بای (٩) دینارە هابا گوێتیەکی شەکرت بدەمێ باکەس نەیبینێ.

مامەقالە:ـ ئەو بای چەندە.

حاجی:ـ ئەویش (١٠٠) فلس.

مامە قالە:ـ حاجی خوا لێت رازیبێت رزقی منداڵە خوا دەت بەخشێ دەبم بە مامیلت گەر رەقابە بە ئاشنایەتیمان نەزانێ!!!!

## هەفتەنامەی چوارهەم

### حەپی قەڵەوی قەدەغەیە

ـ حەپی قەڵەوی قەدەغەیە ـ

بەخوا چاك لات بووم دووچڵ ئێسقانم ماوە نازانم سابیری پورە رەعنا کوێڕا قەڵەو بوو دەڵێ فووی تێ کراوە ئای بەخوا قسەکەی راستە واباشە منیش بچم و دووسێ پاکەت حەپی قەڵەوی بکڕم و بیخۆم با قەڵەوبم وابزانم قەڵەوی بووە بە مۆدێل.

مامە قالە:ـ ئادەی برا دووسێ پاکەت حەپی قەڵەویم بدەرێ

دەرمانخانە:ـ کاکە نیێە قەدەغەیە.

مامە قالە:ـ ئەی کە قەدەغەیە بو دروست کراوە؟

دەرمانخانە:ـ کاکە گیان دکتۆر دەبێ بۆت بنووسێ ئێمە ناتوانین بەبێ رەچەتەی دکتور هیچ بفرۆشین لێ پرسینەوەی هەیە

مامە قالە:ـ ئەی کاکە ئەی تۆ دکتۆر نیت نازانی دووچڵ ئێسقانم

دەرمانخانە: ئەرێ کاکە تۆ شێتی، یان دەتەوێ ئێمە شێت کەی خۆ ئەمە بەرمە یانەکە نییە؟

مامە قالە:ـ باوکم بۆ تورە دەبی خو من بو فروشتنەوەم ناوی داوای دەرمزەنم نەکردوە من دەڵێم دوو یان سێ پاکەت منیش دەزانم لەبەر مەیانی سەوزە فرۆشەکان وەك خۆڵ وایە بەڵام نرخەکەی تۆزێ گرانترەو لێ پرسینەوەش نییە ئەم قەدەغەی تۆ باسی دەکەی لەوێ بەسوپاسەوە دەیفرۆشن

دەرمانخانە :ـ کاکە برۆ بائەو خەلکە بە رێ کەین ئیشمان زۆرە ئەگینا بانگی پۆلیس دەکەم بۆت

مامەقالە:ـ ئای ئەگەر پۆلیس بزانی بەم مشت ومرە نازانم کێ ...... ...: تاوانبارە؟؟؟

## هەفتە نامەی پێنجەم

### ژن هێنان

خوا بیر ەخێنێ وابزانم ئەمرۆ کارەکەم تەواو دەکەم سوپاس بۆخوا دایك و باوکی کچەکە رازین بابزانم شیرم، یان رێوی

سەلامون عەلەیکم

عەلەیکە سەلام یاخوا بەخێربێیت مامە قالە

پاش پشوو و چاخواردن

مامەقالە:ـ ئێ کچم خوا کار رێك خەرە فەرمووتە چەند پرسیارێکم هەیە وامن هاتووم حەز دەکەم گوێت بۆ راگرم بامنیش بزانم پاشان (ئارامی کورم) دەنێرمە لات

کچ:ـ سەیارەی هەیە

مامەقالە:ـ خوا بیداتی تازە دامەزراوە

کچ:ـ سوپاس بۆ خوا دەولەمەندن تۆش تاقە کورێکت هەیە دەتوانی هەموو داخوازی یەکانم جێبەجێ بکەیت

مامەقالە:ـ خوا رێکیخات

کچ:ـ گۆبەرۆکی قەپات، ٦تاك بازن، ملوانکە، عەیارە (١٨)کەمتر نەبێ

٥٠٠ لیرەی رەشادی مارەیی ژووری نوستن و میوان سەلاجەو تەلەفیزیونی رەنگاو رەنگە و ڤیدیووە وەوە... هەتاد

مامەقالە:ـ سوپاس بۆخوا خانوویەکمان هەیەو بەشی ئێمەو ئێوەش دەکات.

کچ:ـ ئەو خانووە بفرۆشن و خانوویەکی دووقات لەهەوارە بەرزە، یان تووی مەلیك بکرن ئێمە لە خوارەوەو ئێوەش لە سەرەوە، یان خۆم چۆن بە باشم زانی.

مامە قالە:ـ کچم ئەریستی کوردەواری تێك مەدە. پێ بەقەد بەرەکەی خۆت راکێشە شەرع بۆ مارەیی (١٩)سقاڵ زێری داناوە.

کچ:ـ خۆ من داوای شتی زیادم نەکردوە. مامە قالە: کچم وا گوێم بۆ داوا کاریەکانت راگرت با ئارامی کورم بێت بۆلات ئەویش گوێت بۆ راگرێ.

مامە قالە:ـ (دوای ماڵ ئاوایی کردن) لە بەر خۆیە وە ئێ دەبێ کێ بۆ دوایی دەگرنەوە، ئەگەر ئارام لەسەر ئەو داواکاریانە ئەرێ بگرێو رازی بێ دەبێ ئارامیش بگرێ بۆ دووسێ ساڵێ تر لەبەر دەم قازیدا

## وێنە شێوە دەر بڕینێکی ڕوون و ڕەوانە



وێنەی
شێخ محمودی حەفید
پاش سەرکەوتنی لەشەری
ئاوباریك دا ڕۆژی ١٩٣١/٢/٥



وینـەی تیپی وەرزشی قوتابخانەی یەکەمی سلێمانی لە سالی ١٩٣١دا، قوتابیان لەڕاستەوە بۆ چەپ:
- ڕاوەستاوەکان «حسن سید احمد، اسماعیل حاجی حسن، جمالی مجید بەگ، سوورە، محمد جاسم، عثمان حاجی عارف، نوری حمە ئەمین ئاغا، نامق ئاغا مصطفی ئاغا»
- ڕیزی دووەم - دانیشتووەکان لە سەرکورسی «زێرو میشو، ابراهیم فەتاح هەرمین، نایناسین، عبد الکریم عبد الله، مامۆستا نوري صالح ئاغا، احمد مصطفی ئاغا، حسن سعید، حمە کاکە اسماعیل، کەریم سعید دەولەت»
- ڕیزی سێ هەم - دانیشتووەکان لەسەر ئەرز «عمر سۆران، محمود حسن، رشید حمە ئاغا، حسن محمد دەباغ، أحمد حسن أفندي



وێنەی مامۆستاو قوتابیانی پۆلی پێنجی سەرەتایی قوتابخانەی پاشای گەورە لە ڕەواندز کە لە سالی ١٩٣٥ کێشراوە ئەمەش ناوی مامۆستاو قوتابییەکانن لە ڕاستەوە بۆ چەپ:
ڕاوەستاوەکانی ڕیزی یەکەم
١ - صدیق حارس ئاغا
٢ - محمد حمد أمین
ڕاوەستاوەکانی ڕیزی دووەم
١ - رشید سید عزیز
٢ - وحید سید صالح
٣ - قاسم بەگ.
٤ - اسعد حاجی.پەری
٥ - صلاح نصرت
٦ - مصطفی حاجی احمد
٧ - سیدا فتاح
٨ - صدیق محمد
دانیشتوانی سەر کورسی «یەکەم»
١ - سیمون دریوش
٢ - نیسان داود
٣ - عبد القادر احمد
٤ - ناجی عباس
دانیشتوانی دووەم
١ - سلێمان مصطفی
٢ - صبری نجیب
٣ - جمشید سلیمان
٤ - یوسف داود
٥ - انور مصطفی
٦ - احمد سلیمان

ئومێد شیرکۆ شاکر ئەم وێنەیەی ناردوە

# گۆشەی ناسین



رەنگین بەوهیوایە دەرگای ئەم گوشەیەی کردەوە تا رۆڵەکانمان بە کچ و کورەوە بە گەورەو بچوکەوە بەدوورو نزیکەوە بەیەکتر بناسێنێت و بەردی بناغەی هاورێتی‌و برایەتی لەناو دڵ و دەروونی هەموولایەکدا دابمەزرێنێت، ئەوی پێویستە (ناوی‌سێ‌قۆڵی، تەمەن، خواست، ناونیشان، وێنە، پولی سەدفلسی)و پەلە نەکردن و دان بەخۆدا گرتن تا بەرێز ناوەکان بلاودەکرێنەوە، ئەمەش دەستەی‌یەکەم لەوانەی مەرجەکانی سەرەوەیان تیدا کۆبوەتەوە، . . .



ناو ـ سالار خانۆ جوج
تەمەن ـ ١٨ سال
خواست:
نامەگۆڕینەوەو وەرزش
ناونیشان: هەولێر ، قەزای مێرگەسوور



ناو ـ نضال روستم أحمد
تەمەن ـ ١٩ سال
خواست: وێنەکێشان ـ چیرۆك ـ ژیانی هونەرمەندان
ناونیشان ـ هەولێر ـ ئەمانەتی گشتی کاروباری کۆمەلآیەتی



ناو ـ جبرائیل عبدالرحمن أحمد
تەمەن ـ ١٦ سال
خواست ـ نامەگۆڕینەوە ـ شیعر
ناونیشان ـ هەولێر ـ گەڕەکی أبن المستوفی ٢٥/١/٢٤٥



ناو: محمد شفیق لیوەژەیی
تەمەن : ١٧ سال
خواست : نامە گۆڕینەوەو وێنە
ناونیشان: هەولێر ئامادەیی پیشە سازی ـ بەشی‌دارتاشی



ناو ـ ناظم جمعە علی (بێزار)
تەمەن ـ ١٩ سال
خواست ـ هونەربەگشتی
ناونیشان ـ التون کوپری ـ ئانویە التون کوپری



ناو سلێمان ئەشقی سلێمان
تەمەن : ١٧ سال
خواست: تۆپی‌پێ، نامە گۆڕینەوە
ناونیشان: هەولێر ـ ژمارەی پۆستە ٤٣٧



ناو ـ ابراهیم قادر خضر
تەمەن ١٨ سال
خواست : یەکترناسین و گۆڕینەوەی وێنە و خەڵات
ناونیشان: هەولێر ، ئامۆژگا ی ڕاگەیاندنی مامۆستایان



ناو ـ عمر محمد مغدید مامەکوردە
تەمەن ـ ١٦ سال
خواست: شانۆ ، خوێندنەوەی گۆڤارو ڕۆژنامە
ناونیشان ـ هەولێر شەقامی عینکاوە ـ ژمارەی خانوو (٦٣)

[illegible]

## بازنێکی‌تر بهێنم

من لاوێکم نزیکەی ٧ساڵە ژنم هێنا وەو هەریەك منداڵمان هەیە کە٦ ساڵانە، ئیتر دەمێکە چاوە روان دەکەم منداڵمان تابێ خەتاش لەژنەکەمە، منیش دەمەوێت ژنێکی تربهێنم، حەز دەکەم منداڵیشمان زۆربێت و توانام هەیە.

ئەمساڵیش کچێکی تەمەن ٢٣ ساڵی زۆر سەرنجی ڕاکێشام و ماوەیەکە بە یەکەوەین و زۆر باش گیروگرفتە کەشم دەزانێت. زۆرم خۆش دەوێت و منی خستۆتە داوی دڵداری بەوە دڵنیاشم‌ئەویش منی خۆش دەوێت چەند جارێك ویستم دڵی خۆمی بۆ بکەمبەوەو ڕووبە ڕوویی بڵێم بەلام خەتای خۆم بوو پە لەم لێ‌نەکرد، پاش ماوەیەك دیسان ویستم باسی بکەمەوە زۆرپەست بوو و ماوەی نەدەدام کەهەموو شتێکی پێ بڵێم، واسەرنجم داوە کەئەم کچە ئاڵۆزو ڕارایە ویستم لە بیری خۆمی بەرمەوە کە دەم توانی‌و زۆر پەست بووم، کە سەرنجم دا ئەو ماوەیە ئەو لە من نەسرەوت ترو پەست تر بووە. جا ئیتر نازانم چۆن؟ تکایە ئەمەم بۆ ڕوون بکەنەوە ئایا یاسا ڕێگا دەدات کە ژنێکی تربهێنم؟ وە بۆچی کچەرێگا نادات دڵی خۆمی بۆ بکەمەوە؟دوایی چۆن بتوانم لەبیر خۆمی بەرمەوە.

ع . ع . سلێمانی

## وەلام :

براگیان، نەختێك بیرو لێکدانەوەت خاوبکەرەوەو لە هەموو سەرێکی بەوە لە مەسەلە کە بکۆڵەرەوە، خوانەی برێ منداڵێکی تەمەن شەش ساڵەو ژنێکی جوانەو دڵسۆزت هەیەوا خوا فەرمانی بەوەداوەکە ژنەکەت هیچی کە منداڵی‌نە بێت وژنەش بەکاری خودا چ دەسەڵاتێکی نی‌یە .. براگیان، ئەوەی خوا بیکات ئەوە باشە. ئەو کچەیش کە باسیت کردووە، خوا دەزانێ‌و

لەوانەیە دوو عومری ئەوت هەبێت ئارەزوو و سروشت ومە یلتان لێك

جیاوازەو وا دیارە ڕارایەو ئەویش بەدوا سەرگەرمی لاوی کەوتوە.

بۆمەسەلەی ژن هێنا نیشتیَ دەبێ لەژنەکەی خۆت بگەیەنیت کە

ناتەوێ کورەکەتان تەنها بژیت و حەزبە منداڵی زۆر دەکەیتو لەبەرخاتری منداڵیش ژن دەهێنی‌و ئەو هەر گەورەی ماڵ دەبێت و هەست و سۆزت بەرامبەری ناگۆرێت، بۆ ئەوەی ڕێگەت بدات.

بەڵام کچەکە، ئەگەر خۆشە ویستی تۆی لەدڵ دا بوایە ورد ورد گوێی لێ دەگرتی‌و ئێستاش لەبیر خۆ بردنەوەی لەدوو ڕۆژی تر ئاسانترە. هیوادارم سەرکەو تووبیت.

## من .. یان .. کاکم

لەبرای‌بەرێز«کوردە ـ م»لە سلیمانی‌یەوە نامەیەکمان بۆ هاتووە واپوختەی نامەکە بڵاودەکەینەوە:
من لاوێکم بەو زووانە دەچمە زانکۆ، لەئازارێکی زۆردا دەژیم ونـاتوانم دەردی دڵی خۆم دەربرم. . کەوا کچێکم خۆش ویستووە زۆر جوان و ڕەوشت بەرزە، بەهۆی ئەوەوە لەگەڵ برا گەورەکەم دا لە زانکۆپێکەوە دەخوێنن بەردەوام دێتەماڵمان، پێکەوە کۆشش دەکەن وباس و لێکۆڵینەوە دەنووسن، هەر کە وەختی هاتنی دەهات من دەچووم زوو دەرگام لێ دەکردەوە تا کاکم دەهات بەیەکەوە قسەمان دەکرد، ڕۆژ لە دوای ڕۆژ خۆشەویشتی ئەولە دڵم دا پەرەی سەند. بەڵام دەترسم دڵی خۆمی لابکەمەوە نەوەکا ئەو لەگەڵ براکەم دا پێوەندی هەبێت، ئەگەرچی وەکو سەرنجم داوە پێوەندیی نێوانیان شێوە برایانەیەو تایبەتی یەبە خوێندنەوە، تۆ دەڵێی‌چی ئایا رازی دڵی خۆمی پێ‌بڵێم؟ یان دڵی خۆم لای کاکم بکەمەوە؟ لەوە دەترسم ئەگەر پێوەندیی خۆشەویستیان لەنێوان دا هەبێت دڵی بیەشێنم؟ من نامەوێ ببمە هۆی ئازاری براکەم وکچەکە. . چی‌بکەم. . باشە؟؟

کوردە: م

لە سلێمانی ـ گەرەکی ڕزگای

## وەڵام :

ئەگەر من ئەم پرسیارە لە خۆت بکەم تۆدەڵێی چی؟کچێکی زانکۆ لەگەڵ هاورێیەکی خۆی پێکەوە بخوێنن وکۆشش بکەن و لەماڵ داپێکەوە دابنیشن، ئایا پێوەندیی نێوانیان دەبێ چ جۆرێك بێت؟ منیش وەکو تۆ بۆ ئەوە دەچم کە پێوەندییان دۆستایەتی‌و دڵخوازی بێت وپێوەندی یەکەشیان پاکەو هەردوولاش دەیانەوێ پێ گەیشتوویی خۆیان لە هەڵس و کەوتیان دا لەلای ئێوە پیشان بدەن، تا ڕەزامەندیی ماڵەوەتان وەربگرن.

ئەمە دیوێکی، دیوێکی‌تری بۆچوونە کەمان ئەوەیەکە. ڕەنگبێ پێوەندی‌یە کەیان بێ‌مەبەست بێت، واچاکە ئەم هەلە لەدەست خۆت نە دەیت. بۆ ئەمەش بە کاکت بڵێ ئەم کچە کچێکی چاکەو شایانی ڕیزگرتن و باوەرپێ کردنەو ماڵەوەتان بەدڵیانە، واتاوای لێ‌بکەکەباسی بێتە سەر باسی حەزلێ کردنی ئەو وهێنانی. جاهەرکەزانیت ئەوبەهیوای‌کچەکەیەو دەیەوێ بی خوازێت یەکەر بێ سێ‌و دوو کردن وازی لێ‌بێنە، بەم جۆرە

دەگریت، بەڵام ئەگەر براکەت رای گەیاند کەهەست و سۆزی ئەو بەرامبەر بەکچەکە برایانەیە، ئەوە دەتوانیت لە براکەت بگەیەنی

کەتۆ مەیلت بەلایەوە هەیەو پاش چەند ساڵی‌تر دەتەوێ ببی بە مێردێکی چاك بۆ کچەکە. بەڵام ئەگەر بۆت نەکرا قسە لەگەڵ کاکەت بکەیت، دایکت، یان خوشکت راسپێرە، یان هەرکەسێکی تر کە پێیدا رادەپەرموێ، بوئەوەی لە راستی بگەیت، چونکە زانینی راستە قینە هەزار جارلەبێ دەنگ بوون لێی با راستە قینەکە تاڵیش بێت.

## ژن هەڵ گرتن

من لاوێکم لە زانکۆ دەخوێنم هەر لە زانکۆدا کچێکی جوان و رەوشت بەرزم هەڵبژارد و حەزمان لە یەکتر کردو رۆژانی بەختیاریمان بەیەکەوە بەسەر برد، لەوە دەترسام بەختیاریمان تا سەر نەبێت و لە دەستم بچێت.

کە چووم بۆ خوازبێنی باوکی رازای نەبوو، پاش ئەوەی زۆر کەسمان لێ راسپاردو کردو کۆشێکی زۆرمان کرد لەگەڵ باوکی کچە کۆبووینەوەو دوا قسەی ئەوە بوو کە دەبێ پارەیەکی زۆر لە بانك بەناوی کچەکەی دابنێم بۆ دابین کردنی پاشەڕۆژی کچەکەی، لەوە تێ‌گەیشتین کە ئەمە مانای نەدانە پاش ماوەێك زانیم کچەکە وازی لە خوێندن هێناوەو شووی بە کابرایەك کردووە کە باوکی بۆی دۆزیوەتەوە زۆر خەمم خواردو بیرم لەوە کردەوە کە چۆن لە کۆری تەماع و چاو چنۆکی‌دا بیرو باوەر لە ناو دەچێت.

رۆژێکیان تووشم بوو، ویستم خۆمی لێ لادەم بەڵام وازی نەهێنا و هەر قسەی لەگەڵ کردم و پێی گوتم کەوا باوکی بە زۆر بەشووی داوەو هیچ خۆشەویستی‌یەکی لەگەڵ مێردەکەی‌دا نی‌یە بۆیە دەیەوێ هەڵی‌بگرم و بە پێچەوانەی رەزامەندی کەسوکاری شووم پێ بکات.

داماوم. دەترسم چ هەڵوێستێك وەربگرم؟ تکایە بۆم روون بکەنەوە.

براتان م.م. داماو

هاوینە هەواری صلاح الدين

## وەڵام

برای بەرێز، لە نامەکەتدا دیارە کە زانیوتە خەتاکە لە چی دایەو لە نێوان خۆشەویستەکەوت و نەریت و خوو رەوشتی کۆمەلایەتیمان دا داماویت.

بێ‌گومان، باوکی چاك ناکات کە لە بەر خاتری پارە بیبێتە بەرهەڵستی بەختیاری خێزان و نەیدا بەتۆ، بەڵام وا بزانم ئەمە بیانوو بووە بەو بەڵگەیە کە کچەی دا بە کابرای تر داوای پارەی بانك و ئەو شتانەی لێ نەکرد، هەتا رای کچەشی وەرنەگرت.

هەندێ باوك بە بیرو باوەری بەر لە ساڵانی زوو دەروانە مەسەلەی ئێستا، بۆیە تا گیروگرفتەکە پەیدا نەبێت و کارەسات تووش نەبێ بە خۆیان نازانن و ئەو دەمیش پەشیمانی داد نادات.

دەبێ براگیان، یەکسەر لێی دوور بکەویتەوەو تێی بگەیەنە کە تۆ لە خوا دەترسیت حەز لە کووکەو کارەسات ناکەیت و رەوشت ونەریتی کۆمەلایەتیمان رێگە بەوە نادات دەستدرێژی بکەیتە سەر سامانی خەڵك وە ئەو بیرەی لە کەللەدایە، حەرامەو نابێ هەرگیز بەم لایەدا بیر بکاتەوەو. دەبێ وازت لێ‌بهێنێ. ئەگەرنا تێی بگەیەنە کە مەسەلەکە بە باوکی رادەگەیەنیت کاکە نابێ هەموو شت بەپێی هەست و سۆزی دڵ بێت دەبێ ژیریشی لێ بخەیتە کارو وریای دوای رۆژی خۆیشت بیت.. دواییش هەر ئەم جارە نی‌یەو جارەهای ترت لە بەردەم دا ماوە کە بە ئامانج بگەیت.

بیر لە خوێندن و کەسوکارو خوای خۆت بکەوە

## کورتە وەڵام

بۆ خوشکە (أ.م.ی) لە سلیمانی:

خۆت لەو ژنە دوور بخەرەوە هیچ گومانی تێدا نی‌یە دەکەویتە بەر قسەو قەسەلۆکی خەلکی، چونکە وا دیارە رەوشت نزمە، جارێکی تریش ئامۆژگاری بکەوە، ئەگەر وازی نەهێنا باشە ئەگەر نا چاکترین شت بۆ خۆت و بۆ ناوبانگی خۆت ئەوەیە لێی دوور بکەویتەوە

بۆ دڵدار: س، ص، ض لە ئەلمیم:

کچی خۆم، ئەم هەموو دلداری‌یە بۆچی؟ ئایا کورەکە شایانی ئەوەیە؟ ئەو بە تۆ دەزانی‌و ئاوڕت لێ نادانەوە، وا کچێکی کەی خواستووە، ئابروو سەربەرزیی خۆت راگرە!

بۆ ی.ی.ر داماو لە دهۆك:

تۆ خۆت هاری‌کاری‌و یارمەتی کەسوکاری خۆت نەویستت، ئی‌دی بۆچی خەم دەخۆیت؟ جارێکی دی رەوە لای خێزانی خۆت و ئامیزی‌لەوان، لە دلیادا دلۆڤانی‌و خۆشەویستی کەسێك چاکتر نی‌یە



ئامر ب

## يەك پەرداخ بەسە

شارەزانی نەخۆشییەکانی گەدەو ریخۆلە دلنیان کە بەیانیان بەر لە نانـا (بەرچایی خواردن) نۆش کردنی پەرداخە ئاوێك بۆ چالاك کردنی کاری گەدەو ریخۆلەکان زۆر باشەو بارمە تیدەرێکی چاکیشە بۆ بە دەرەوەنانی پاشەرۆکی خواردن بەئاسانی. نۆشداران دەڵێن، وا چاکە ئاوەکە وکانە ئاو - مەعدەنی»و روون بێت، تا بە باشی کاری خۆی بکات، بە مەرجێك سارد نەبێت نەوەکو ببێتە مایەی تووش بوون بە رەوانی.

جگە لەمە، ئەوەی پێویستە بی زانین، ئاوخواردنەوە کارێکی باش دەکاتە سەر گەشیی پێست و ئاودێری دەموچاو بەتایبەتی هی ژنان.



خاتوونەکە، ئەگەر پێویستیت بەلەچاوکردنی چاوێلکە بوو ترسی ئەوەت نەبێت خوانەخواستە چاوێلکە بتوانێ جوانیی چاوەکانت بشارێتەوە بەرمەرجێك ئەگەر زانیت چ جۆرێکیان هەڵ بژێریت و بزانیت کامەیان لەگەڵ شێوەی دەموچاوت دا دەگونجێت.

ئەگەر شێوەی دەموچاوت هێلکەیی بوو، ئەوە دەتوانیت هەر جۆرە چوارچێوەی چاوێلکەیەك هەڵ-بژێریت کە حەزی پێدەکەیت، چونکە رووی شێوە هێلکەیی هەموو جۆرە چوارچێوەی چاوێلکەی لێ دەوەشێتەوە.

بەڵام ئەگەر دەموچاوت خربوو بابڵێین شێوە بازنەیی بوو ئەوا دەبێ چوارچێوی چاوێلکەکەت شێوەبادامی بێت واتا بەرەو سەرەوە هەڵ گەرابێتەوە.

بەڵام ئەگەر رووت درێژکۆلەبوو، وا چاکە چوارچێوەی مەیلەو بازنەیی خر لە چاو بکەیت بۆ ئەوەی تا رادەیەك ركیی دەموچاوت کەم بکاتەوە.



# ڕەنگ گۆڕینی کڵافەی تۆ

خاتوونەکە! ئەگەر لەو کەسانەیت حەزدەکەیت چەند کڵافەیەکی پرچت بە ڕەنگی زەرد، یان ماشوبرنج (ڕەنگی مێش) بۆیە بکەیت، پێی ناوی بچیتە لای قژێکخەر، بەڵکو دەتوانی بە دەستی خۆت کارەکە بە ئەنجام بگەیەنیت، چونکە کارگەیەك لە ڕۆژاوادا دەستەیەك بۆیەی ڕەنگینی تایبەت بە ڕەنگ گۆڕینی پرچی داهێناوە کەوا بە هۆی فلچەیەکی باریکەوە کە پۆرگێلی لە ناودا قایم کراوە، هەر کە پاڵ بە پۆرگەکەوە بنرێت بۆیە بەسەر ئەو کڵافە پرچەدا دەپرژێ کە دەتەوێ ڕەنگی بکەیت.

ئەم ڕێگەیەش لەبەر ئاسانیی بەکاربردن و هەرزانیی نرخی زۆر پەسەندکراوەو برەوی سەندووە.

## بابێستت باراوو
## ڕووبە [illegible]



شارەزایانی خوراك دووپاتی دەکەنەوە کە پێستی ڕوونی بێ زیپکەو **گرژو** لۆچ بەوە پەیدا دەبێت کە لەش ڤیتامینی تەواو وەرگرێت و ئاوی پێویستی بەردەوامی پێ بگات. ئەو ورشەو پرشەیەی لە ڕووی زۆر ژنانی دەبینین ئەنجامی پیرەوکردنی (ڕژێمێکی) ڕێك وپێکی خواردنەو خواردنی چاك و هاوسەنگە، کەوا بەکارهێنانی پۆدرەی ئارایشت و ڕۆن و کرێمی گران بایی یان لە کۆڵ دەکاتەوە.

شارەزایان هەروەها دەڵێن، قاپێك زەڵاتەی سەوزەو یەك دوو دەنك میوەی تازە هەموو ڕۆژێك دەستەبەری ورشەو پرشەی گۆناو ئاوداریی دەموچاوە، سەرباری زیادە بریقەی نیگاکان. دە کەوایە تا زووە، دەرگاری بەفرگرەکەت بکەوەو **زەڵاتە** بخۆ، با جوانتر بیت.

## جوانترین ماکیاجی ئیواران



کۆمەڵەی شارەزایانی ئارایشتی بەریتانیا، لەم بەیننەدا پێشبرکێیەکی ڕێك خست بۆ هەڵبژاردنی جوانترین ماکیاجی سبەینان و ئیواران ، کەوا ژمارەیەك وەستاو شارەزایانی ماکیاجی فەرەنساو بریتانیاو وڵاتە یەکگرتووە کانی ئەمریکاو ژاپۆن بەشدارییان تێدا کرد. هەروەها سەدان کچ و ژنی تەمەن لەنێوان حەڤدەو سیو پێنج ساڵی دا خۆیان تێ دا پیشان دا. لە ئەنجام پاداشتی جوانترین ماکیاجی ئیواران بەر لی یونگی ژاپۆنی کەوت. کە ئەم ماکیێرە ماکیاجێکی هێمن شێوەی بۆ کچێکی تەمەن بیست و دوو ساڵی هەڵ بژاردبوو کە دوور بوو لە سواغ دان بە پاتە ڕۆن و پۆدرە، بەڵکو هاتبوو بە هۆی کۆمەڵێك ڕەنگی هێمن و هاوئاهەنگەوە دروشمەکانی دەموچاوی کچەکەی دەرخستبوو.



# بۆ بەژن ڕێکیی تۆ

ئایاحـەزدەکـەی هەتا دوای بوونی چوار منـدالیش هەر بەژن ڕێـک بێت؟ گۆڤاری «وومەن»ی بەریتانیا بەم ناونیشـانـە ڕیپۆرتاجێکی ، دووروودرێـژی نووسیـوەو باسی بەژن ڕێـکـیو خۆراك و یاریـی وەرزشی کردووە کە ئەمـانـە چ کارێـك دەکـەنـە سەر ئەوەی لەشو لاری ژن نەرم وشل و بەکێشمان بێت، هەتـادوای ئەوەی دەبێتـە دایکی چوارمندالیش.
ڕیپۆرتـاجـەکـە دێتە سەر ئەوە کە بلێ ژنـی زیـرەکـی خاوەن ویسـت ورای بەراستی دەتـوانێ دەسـەلات بەسـەر ئەوەنـدە خواردنـەدا پەیدا بکـات کە دەی خوات و هاوسـەنگییەکی لەگـەل یارییەکانی وەرزش و جومناستیك دا پێ ڕابگـرێت، کە ئەم یارییـانە پاشماوەی زیادی خۆراك لە لەش دا دەسووتێنن.
گۆڤـارەکـە نموونـەی بە لەش و لاری ژنـە ئەکتـەرەکـانی سینـە ما هێنـاوەتـەوە کە ئەوانیش خۆ وەکـو ژنـانی تر وان، بەلام بایـەخێکی زۆرتر بە لەش و لارو خۆراکیان دەدەن، بۆیە هەمیشە بەژن ڕێك و شۆخ و شەنـگ دیـار دەبـن. . کەوابێت بەژن ڕێکی کارێکـە لە هەمـوو تەمـەنێك دا شایانە بێتەدی ئەگـەر مرۆڤ ژیـریو هێـزی ویـست و ڕای خۆی بەکارهێنا.






## چرایەکی کارەبایی بەتام

کۆمپـانیـایـەکی تایبەت بە دروست کردنی ئامێری کارەبایی ناومال لە فەرەنسا لەم دوایی یە دا چرایە کی کارەبـایـیـی سـەیـرو جوانـی بۆ ژووری مندالان داهێناوە. . کە بە ڕاستی شیوەکەی تازەیە.
چرایـەکـە پلاستیکـەو ڕەنگـەکانی هێـمـن و ڕۆشـنـن و لە شێـوەی چوکلێت، یان مژمژەیەکی بەتـامی منـدالان دایـە، بەرزیی . ئەم چرایەش ٦٨ × ١،٢٠ سانتیمەترە.



# فلیمی منداڵان

کاسێت و فلیمی ڤیدیۆ نابێ هەر بۆ گەوران بێت. بەڵێ ئەم جارە کۆمپانیایەکی بیانی کۆمەڵە فلیمە کارتۆنێکی تایبەت بە منداڵانی خستوتە ناو بازارەوە.
ناوەرۆکی ئەوفلیمانەش، ئامانجدارن و لەبابەتی کێشەی نێوان چاکەوخراپەو نێوان نەزانیو زانستی دەدوێن و بە سیناریۆیەکی رەنگینی وەها نووسراون کە زەینی منداڵ وەئاگادێنن و ئاسۆی بیرکردنەوەی فراوان دەکەن.





دەزگا پیشانگاکانی پاریس لەم دواییەدا چەردەیەکی هەمەجۆر جل وبەرگی وە رزی زستانەی منداڵانیان خستەڕوو، ئەم جارە تۆماشەکانیان تووك نەرم و ڕەنگە تۆخن، مۆدێلەکانیشیان بە جۆرێکن کە منداڵان دەتوانن بە ئاسانی لێیەوە بیزوون.
ئێمەش ، خاتوونەکە، وا کۆمەڵێك لەو نموونە جل وبەرگانەت پیشان دەدەین، بەڵکو جۆێکی بۆ جگەرگۆشەکەت لێ هەڵ بژێر یت



# خالد دوسکی

هونەرمەند **خالد دوسکی** ناڤ کێ گەشەو خویایە دناڤ فەرهەنگا هونەرێ کوردیداو گولەك جاران مە گول ڤی ناڤی بویە دیسان گەلەك جاران مە لسەر شاشا تیلەڤزیونا بەغدا ئەڤ ناڤە دیتیەوخاندیەو روژەکێ چاڤێ من ب کەڤالەکی کەفت کو بێ لسەر **نڤیسی** (الخطاط خالد الدوسکی) **بێگومان** ئەز پالدام وئەز چوم من **پسیارا هونەرمەند** خالد دوسکی کر من دیێت **بێ** مژیل بو ب نەخشکێشانا (تصمیم) روژناما دهوکێ ژبو روژا پاریزگەهێ... وپشتی مە هونەرمەند خالد الدوسکی دیتی گەلەك کەیفا خو ئینا دەمێ زانی دێ چاڤپیکەتنێ لگەل کەین بو گوڤارا (رەنگین) وبسوپاسیڤە جابا بەرسڤێت گوڤارا رەنگین دا

● خالد **دوسکی** کی یە؟

- **خالد محمد** یونس دوسکی **لسالا ١٩٥١ لگوندێ هەسەن پیرکا ئەوا دکەڤیتە بەر قەزا ئامێدیێ.**





هاتیمــه دونیــایێ ولــسالا ۱۹٦۱ هاتیمــه دهوکێ ولسالا ۱۹٦۸ ئەز چویمە بەغدا لئاموژگەیا هونەرێت جوان و لــسالا ۱۹۷۳ ئاموژگــەیــا هونــەرێت جوان من بدیمــاهی ئینــایــە پشکــا هونــەرێت تەشکیلی پەیکــەرتاش (النحت) وئــەز لوێ سالی تەعین بوم لتێلەڤزیونا بەغدا وەك خوشنڤیس (خطــاط) ولــسالا ۱۹۷۸ ئەز چویــمــە پــشــکــا دیــکــوری‌و کارێ من تصــمیــم وتنفیذا دیکورا بو پروگرام و فیلما و مسلـــەلا ولــسالا ۱۹۸٦ ئەز هاتیمــه دهوکێ نهو بەرپیــارێ پشکــا هونــەری‌مــە ل ریڤــەبــەریــا رەوشەنبیریا جەماوەری لدهوکێ

● تە بوچــی هەتــا نهــو چ پیشانگەهێت خەتی نەڤەکرینە؟

- براستی هەتا نهو چ دەرفەت چێ نەبویە کو ئەز پیشانگەهەکێ ڤەکەم چنــکــی ئەز گەلــەك یێ مژیــلم بکــارێ ریڤــەبــەریــا رەوشــەنبیریڤە بەلــێ من لبــەرە ڤەکــەم بەلــێ پاکەنگی نزا؟

● توچ رەنگێ خەتی بکار دئینی؟

- خەتێ (النسخ) ئەز بکار دئینم.

● ژکارێت تە کرین و بدلێ تەڤە نیسیای؟

- زنــجیــرا (المتنبی) تەوا هاتیــە پیشــانــدان لتێلەڤــزیــونا بەغدا ژ تصمیمــا من بو هەروەســا زنجیرا



(ابــراهیم طوقــان) ودیــسا من پیشەکی بو زنجیرا (الحالمون) دانایە.

رەنگین: تەچ شیــرەت هەیــە بو خەت خوشێت دەستپێکەر؟

- براســتــی هەکــە مروڤی بڤێت بگەهیتە ئارمانجەکێ پێتڤیە مروڤ بوەستیت هەتــا بگــەهیتە مرادا خو وێ ژخو رازیبیت ونەهەچێ رابو دێ بیتــە (خطاط) خەتی رێکێت خو بێت هەین.

● چی دی تە هەیە بێژی؟

- ئەز سلاڤ وریــزێت خو دکــەمە دیاری بو هەمی کارکەرێت گوڤارا ڤەشــەنگ (رەنگین) وهندی بێژی گوڤــارەکا بەرکەفتیە وهێژایە بهەمی لایــاڤــە نەخاسمە بلایێ دەرهێنانێ ڤە وجارەکادی سوپاسیا هەوە دکەم



● احسان صدیق ئامێدی ●

لقی دهوك

## مەتەڵی ژمارە ١٠

مەتەل [٧] پیتە ڕوشنبیری کورد
بیری لیکەوە بەجوانی، وردوورد
بیرو دەستکردی باوو باپیرە
ناوێکی خۆشە گەلی دلگیرە
پیتی (٤) و (٥) لەڕیزی یەکان
ئافرەت جوان ئەکا بۆ شایی و سەیران
پیتی ٤و٥، ٦و٧ تەواو
پاك لەکاتەوە میکرۆبی ناوئاو
پیتی ٤و٦ لەگەڵ کۆتایی
جیهان نابینێ هەرگیز چاوی
پیتی ٢،٥ یەکی لەتەکا
لەجادەی چیا زوورزوویی تەگا
پیتی ٤و٣، ٢و٥ی لەسەر
لە ڕووی ژیان هەردەم دەربەدەر

## سەرەنجامی گرەوی ژمارە «٩»

گرەوەکەش

چیای

( هەورامان)ە

یەکەم ـ شیرین حمەسعید سلیمان ـ اعدادیة صناعة بکرەجو
دووەم ـ جاسم غەریب ئەیو ـ هەولیر ـ گەرەکی بەهار ـ
سێیەم ـ سازان احمد صالح ـ کەرکوك ـ گەرەکی تەپە ٢٦/١٤٥



ـ پێنج جیاوازی نێوان ئەم دوو وێنەیە لەیەك دەقیقەدا بدۆزەرەوە!!



ـ ئاخو کام یەکێك لەم سێ ڕێگـانـە زووتر دەمان گەیەنێتە ماڵی داپیرەمان









## ئاسۆیی

١ ـ شارێکی کوردستانە ـ ئامێرێکی مۆسیقای ڕۆژهەلاتی‌یە

٢ ـ کەنگێکی مۆسیقی‌یە (پ) ـ ڕاناوە (پ) ـ ژمارەیە

٣ ـ شانەی هەنگی لێ‌دروست دەکرێت (پ) ـ جۆرە خشۆکێکە

٤ ـ . . . . . . . .

٥ ـ چوار پیتی وشەی (مۆرانە) ـ نیوەی یەك (پ)

٦ ـ دوو پیتی وشەی (ڕۆڵ) ـ پیتەکانی (هات)

٧ ـ دوو پیتی وشەی (مەل)

٨ ـ ئیمپراتۆری یابانی

٩ ـ سێ پیتی وشەی (ڕێگا) ـ پیتەکانی (شێر)

١٠ ـ ڕازا یان واس واس ـ ئەندامی بینین

## ستونی

١ ـ بیر ـ باڵندەیەکی گۆشت خۆرە (پ)

٢ ـ ژمارەیە (پ) ـ جۆرە میوەیەکە

٣ ـ نێچیرگرتن

٤ ـ ڕووەکێکی خۆهەڵواسەرە ـ پێچەوانەی ڕاست (پ)

٥ ـ دۆزەخ بە ئینگلیزی

٦ ـ پایتەختی وڵاتێکی کەرتی ئەوروپایە ـ ئامێرێکی مۆسیقایە.

٧ ـ دوو پیتی (شێت)

٨ ـ کێ بە ئینگلیزی ـ چەکەرە پ)

٩ ـ پایتەختی ئەلبانیا (پ) بەڵێ بە ئەڵمانی

١٠ ـ ناوی میوەیەکە (پ) ـ شاعیرێکی سێ کوچکەی بابانە.

## پێشبڕکێ جوانترین منداڵ

# لەنێوان گوڵ و گوڵزارا



ڕێکان، ڕوژان، ڕوناك علی نقشبندی



ڕۆزا عیرفان مەردان



گەشاو محمد بكر ابراهیم



ئاڤان جلال احمد



ڤیان رزگار اسماعیل



شۆخان جلال احمد



مزگینی سواری



پۆشان بهاءالدین مەلاسعید



احمد محمد احمد



حیدر،نوره رشید



نیگا شاکر



ڕەوەند عمر عنایت



بنار قادر مصطفی



تایەن فاضل شەوڕۆ



ژیلوان ابو بکر صابر



یف ماهر محمد عبد الرحمن



أنس ماهر محمد عبدالرحمن

# کاریکاتێر

نهلة جزراوی




## وردە والا















«دوای چارکردنی کاروباری ئافرەتە دەلاڵەکان لە بەغداد»
روویان کردە شارە دوورەکانمان

